# دەنگی پیرەمێرد لە بزووتنەوەی شیعری نوێی کوردیدا

**د. محەمەد فازل مستەفا**

هەولێر - ٢٠١١



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **دەنگی پیرەمێرد لە بزووتنەوەی شیعری نوێی کوردیدا**
- **نووسینی:** د. محەمەد فازل مستەفا
- **نەخشەسازی ناوەوە:** ڕەوان
- **بەرگ:** وریا بوداغی
- **ژمارەی سپاردن:** (٤٥٦) لەساڵی ٢٠١١
- **نرخ:** (٣٠٠٠) دینار
- **چاپی یەکەم:** ٢٠١١
- **تیراژ:** ٥٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی ڕۆژهەڵات (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٥٦٣)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

**بە :**

**ـ گیانی باوکم و دایکم**

**ـ براکانم**

**ـ ژیان**

**ـ سنور**

**ئالان**

**سارا**

**پێشکەش بێت**



## ناوەرۆك

## سوپاسنامە

- سوپاس و ڕێزو خۆشەویستیم بۆ مامۆستام (د. دلشاد عەلی) کە بەگیانێکی لەخۆبووردوانەو دڵسۆزانەو زانستیانەوە سەرپەرشتی ئەم نامەیەی کرد، بەردەوام هاندەرم بووە و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە مەبەستی بە ئەنجام گەیاندنی نامەکەبوو، هیوادارم تەمەن درێژو سەرکەوتوو بێت.
- سوپاس بۆ هەردوو ڕاگرایەتی و بەشی زمانی کوردی زانکۆی سلێمانی و زانکۆی سەلاحەددین کە ئەم دەرفەتەیان بۆ ڕەخساندم.
- سوپاس بۆ هەموو ئەو مامۆستا و هاورێ ئازیزانەم کە یارمەتیان داوم و دڵسۆزانە مەبەستیان بوو نامەکە بگاتە ئەنجام.
- سوپاس بۆ هاوکاری سەنتەری (زین) بە تایبەتی کاك (ئەنوەر عبدالقادر) کە بەرنامەیەکی (Access) بە دیوانی پیرەمێرد بۆ دارشتم. هەروەها سوپاسی مامۆستا ( هەڤاڵ ئەبوبکر ) دەکەم کە ژمارەکانی ڕۆژنامەی (ژیان) و (ژین) ی خستە بەردەستم.

# پێشەکی

وەك ئاشكرایە پیرەمێرد دەنگێکی ئەدەبی و شیعریی و رۆشنبیری گەورەو مەزنی گەلی کوردە، لەگەڵ ئەوەشدا کەم لێکۆڵینەوە دەبینرێن کە روویان تێ کردبێ، جا ئەگەر هۆکارێکی ئەم بایەخ نەدانە بە پیرەمێرد پەردە پۆشکردنێکی سیاسیانە بووبێ چ لەسەردەمی خۆیاو چ لە دوای خۆشی ئەوا هۆکارێکی تر فراوانی و دەولەمەندی جیهانە ئەدەبییەکەی بووە بە تایبەتی جیهانە شیعرییەکەی کە ئەگەر لێکۆلەر وریایانە و زانستانە رووی تێ نەکات تیایدا ون دەبێت و بێ ئەنجام لێوەی دێتە دەرێ.

هەر لێرەوە تەرخانکردنی لێکۆڵینەوەکەمان بۆ بەرهەمە شیعرییەکانی پیرەمێرد بۆ خۆی هەوڵدانێکە لە پێناو هێنانە سەرەوەی پیرەمێرد بۆ ناو بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و رەخنەی کوردیمان تا لەو پەراوێزکردنە دەربازی کەین و زانستانە لێکۆڵەران بەرەو جیهانە شیعرییەکەی بەرین.

بەم پێیە و لە پێناو بەدیهێنانی ئەو ئامانجەدا لەلایەك و دەرخستنی دەنگی داهێنەرانە و نوێخوازیانەی پیرەمێرد لە جیهانی شیعری کوردی کرمانجی خواروودا ئەو ناونیشانەمان بۆ لێکۆڵینەوەکەمان دیاری کردووە.

بۆ گەیشتن بە کۆمەڵە ئەنجامێکیش کە ئامانجەکانمانی تیادا بەرجەستەکرێن پلانی لێکۆڵینەوەکەمان بەم شێوەیە کردووە بە سێ بەشەوە:

لە بەشی یەکەمدا کە بە ناونیشانی ( پیرەمێرد لە بازنەی بزووتنەوەی شیعری نوێی کوردیدا ) یە روومان لە سێ تەوەری سەرەکی کردووە کە یەکەمیان بە ناونیشانی (شیعری نوێی کوردی ـــ چەمك و تێروانین ) ە و تیایدا روومان لە بزووتنەوەی نوێخوازی ئەدەبی تورکی و عەرەبی و فارسی و پاشان کوردی کردووە، بەو پێیەی هێڵێکی پێوەندی ئاشکرا لە نێوانیاندا بەدی دەکرێ بەتایبەتی هێڵی کاریگەر بوونی ئەدەبی کوردی بەگشتی و شیعری کوردی بەتایبەتی بە رێچکەی نوێخوازی لە ئەدەبی ئەو سێ میللەتە دراوسێیەی کورد دا.

لە تەوەرەی دووەمیشدا کە ناونیشانی ( دیدی نوێخوازیانەی پیرەمێرد ) مان بۆ هەڵبژاردووە رووەمان لە سێ بواری چالاکیەکانی پیرەمێرد کردووە کە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرین،



بەو پێیەی تێروانینی نوێخوازیانەی پیرەمێرد لەم بوارانە دا راستەوخۆ پێوەندیان بەتاقیکردنەوە ئەدەبییەکانیەوە هەیە بە تایبەتی تاقیکردنەوە شیعرییەکانی، هەر بۆیە تەوەری سێیەممان لەم بەشەدا بۆ ئەو باسە تەرخان کردووەو ناونیشانی ( دەنگی نوێخوازیانەی پیرەمێرد لە بواری ئەدەبدا ) بۆ دیاری کردووە.

بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەشمان کە بە ناونیشانی ( دەقە شیعرییەکانی پیرەمێرد لە بازنەی هونەریدا ) یە بۆ سێ باس تەرخان کردووە کە بریتین لە ( زمان و وێنەی شیعری و ئاوازی شیعری ) لەبەرهەمە شیعرییەکانی پیرەمێرد دا، هەوڵمان داوە لە هەریەکێ لەو باسانەشدا زانستانە توانای داهێنانی شیعریی پیرەمێرد دەرخەین و هەنگاوی نوێخوازیانەی لە ولایەنە هونەریانەدا دەست نیشان بکەین.

هەرچی بەشی سێیەمی لێکۆڵینەوەکەمانە کە بەناونیشانی ( دەقە شیعرییەکانی پیرەمێرد لە بازنەی مەبەستدا ) یە بۆ ئەو بابەت و مەبەستە شیعریانە تەرخان کردووە کە پیرەمێرد هۆشمەندانە و وشیارانە روی تێکردون کە بریتین لە شیعری سیاسی و شیعری نیشتمانی و نەتەوایەتی و شیعری کۆمەڵایەتی و شیعری جوانکاری و شیعری بۆنەیی کە بۆ خۆیان و لە زۆر لایەنەوە بەرجەستە کەری تێروانینی نوێخوازیانەی پیرەمێرد بوون وەك دەنگێکی گەورە و مەزنی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە ئەدەبی کرمانجی خواروودا.

لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەشدا هەوڵمان داوە ئەو ئەنجامە دیارو گرنگانە بخەینە بەردەست کە لێکۆڵینەوەکەمان پێیان گەیشتووە کە هیوادارین ئەنجامی نوێی زانستانە بن و لێکۆڵینەوەی تر بە دوای خۆیاندا بهێنن.

وەك ئاشكرایە دەنگە شیعرییەكەی پیرەمێرد لە قۆناغێكی ئەدەبی كوردیدا دەركەوت كە سیمای نوێكردنەوەو تازەكردنەوەی پۆشیبوو كە دیارە مەبەستمان لە بیستەكانی سەدەی رابردووەوە، هەر بۆیە یەكێ لەو باسانەی كە دەربارەی پیرەمێرد روو بە روومان دەبێتەوە باسكردنە لە پێگە و شوێنی پیرەمێرد لە بازنەی ئەو رەوتە نوێیەی شیعری كوردی، بۆ چوونە ناو ئەم باسەش بە پێویستی دەزانین سەرەتا باس لەو رێرەوە نوێیەی شیعری كوردی بكەین و پاشان ئاور لە دەنگە شیعرییەكەی پیرەمێرد لەناو ئەو رێرەوە شیعرییەدا بدەینەوە.

## أ ـــ شیعری نوێی كوردی ـــ چەمك و تیروانین

گومانی تیانییە كە خواستی گۆرین لەرەوتی شیعریی و رووكردنە داهێنانی نوێ لە هەموو سەردەمێكی ئەدەبیدا لەلای تاكە تاكەی شاعیران بەدی دەكرێ، بەڵام دیارە ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەو بزووتنەوە یەیە كە وشیارانە بناغەكەی رەنگ رێژ كراوەو كۆمەڵە شاعیرێكیش روویان تێ كردووە بەو مەبەستەی رەوتی شیعری بگۆرن و بەرەو شەقڵێكی نوێی سەردەمیانەی ئاراستەكەن، كە دیارە ئەم دیاردەیەش لە رەوتی شیعری كوردی سەرەتای بیستەكانی سەدەی رابردوو لە كرمانجی خواروودا بە ئاشكرا بەدی دەكرێ و هەر كاتێكیش باس لەو رەوتە كرابێ باس لە ( شێخ نوری شێخ ساڵح و گۆران و رەشید نەجیب و پیرەمێرد ) كراوە.

هەر لێرەوە كاتێ بمانەوێ باس لە شیعری نوێی كوردی بیستەكانی سەدەی رابردوو بكەین ئەوا ناچار دەبین كە سەرەتا ئاورێك لە بزووتنەوەی شیعری ئەو میللەتانەی دراوسێی گەلی كورد بدەینەوە كە هەر لەو سەردەمانەدا یا كەمێ پێشتر رووەو نوێكردنەوە هەنگاویان هەڵناوە و كەم و زۆریش كاریگەرییان لەسەر رێرەوە نوێیەكەی شیعری كوردی بەجێ هێشتووە بەتایبەتیش شیعری توركی و عەرەبی و فارسی.



## ١ـــ نوێخوازی لە ئەدەبی توركیدا

وەك ئاشكرایە پێش كۆتایی هاتنی سەدەی نۆزدەیەم و لەسەردەمی دەسەڵاتی سوڵتان (عبدالحمید) دا كۆمەڵە رۆشنبیرو كاربەدەستێكی ئەوسەردەمە كە كاریگەر بوون بەگیانی رۆشنبیرێتی ئەوروپایی و بیریان زاخاو درابوو بە بیری پێشكەوتووخوازانە، لە ناویاندا( رەشید پاشا ) رۆڵێكی دیاریان هەبوو بەوەی كە( سلطان عبدالحمید )لە (٣) ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٨٣٩ز) دا فەرمانێكی دەركرد لەژێر ناوی ( كلخانة خط همایونی ) [*] كە بە ( فەرمانی تنقیمات ) ناو دەبرێ و دواتر ئەدەبی تنقیماتی لێ دروست بوو [١].

ئەوە بوو لەژێر كاریگەری ئەو گۆرانكارییەدا نووسەرێكی وەك( ابراهیم شناسی) رۆژنامەی (ترجمان الاحوال ) ی دەركرد كە بۆخۆی سیمای رێچكەیەكی نوێی ئەدەبی توركی وەرگرتبوو [٢]، دەربارەی ئەم رێچكە ئەدەبی یە ( گان بینار ) ی نووسەری تورك دەڵێ: (( ئەدەبی تنظیمات لە ئەنجامی ئەو بیرۆكانە دروست بوو كە لە كۆمەڵگای توركیدا بڵاو بوو وە پێویستی بە گۆرانكاری بوو، ئەمەش لەپێناو خزمەت كردنی بوو بە مرۆڤ و بیركردنەوەیەكی نوێی و پەیرەوكردنی زمانێكی سادەو ئاسان بوو )) [٣].

بێگومان ئەدەبی تنقیماتیش بۆ خۆی كە لەژێر كاریگەری ئەدەبی فەرەنسی دا بوو، رێگای خۆش كرد بۆ سەرهەڵدانی رێگەی تری رێچكەی ئەدەبی بەتایبەتی ئەو رێچكەیەی كە بە (ثروة الفنون) ناسران و رابەرەكانیشی بریتی بوون لە ( رجائی زادە أكرم ـــ توفیق فكرت ـــ خالد چیا ـــ جناب شهاب الدین ـــ جلال ساهر.... هتد ) بانگەشە كەری ئەوە بون كە (( سەرجەمی ئەدەبی رۆژهەڵاتی

---

(*)( كلخانە خطی ) بە یەكەم رێكخستنی دەستوری نوێ دادەنرێ لە دەولەتی عوسمانی، كەرێكخستنی وەرگرتنی باج و دادگایی كردنەكان بوو بەپێی بنەمایەكی نوێ، هەروەها پاراستنی سەرومالّی خەلّكی بوو بەپێی دەستور: بروانە: عبداللطیف بندر اوغلو، قصائد مختارة من اشعر التركی المعاصر، بغداد، دار الشؤون الثقافیة، ١٩٨٦، ص٢٤

١ـ اكمال الدین احسان، من الادب التركی الحدیث، الهیئة العامة للتألیف والنشر، ١٩٧٠، ص٢٦

٢ـ اتیلا اوز قرملی، التیارات الادبیة فی الادب التركی، مجلة الاداب الاجنبیة، العدد (١١٨)، ٢٠٠٤، ص٥

٣ـ عبدالطیف بندر اوغلو، قصائد مختارة من الشعر التركی المعاصر: ص٢٤

دەبێ ڕەتکرێتەوە بەو هۆیەی ئەدەبی تورکی لەژێر کاریگەری ئەدەبی فارسیدا نوقم بووە، بۆیە دەبێ هەوڵ بدرێ ڕەوانی زمانی فەرەنسی تێکەڵ بە زمانی تورکی بکرێ و هەروەها کۆمەڵ و ڕێکخراوە ئەدەبییەکانی پێشوو دەقاو دەق بابەتی شانۆگەری و چیرۆك و ڕۆمان و ڕۆژنامەگەرییان لە ئەدەبی ئەوروپاییی وە هێناوەتە ناو ئەدەبی تورکییەوە، دەبێ کۆمەڵەی ئێستاش لەسەر ئەو ڕێبازە بەردەوام بن تا بەباشی ئەم بارە ئەدەبیانە جیگیر دەبن ))[١].

دوا بەدوای نووسەرانی ( پروە الفنون ) یش دەستە نووسەرێکی تری نوێخواز کە بە کۆمەڵەی (فەجری ئاتی ) ناو دەبرێن دەرکەوتن کە دیارترینیان ( جەلال ساهر و ئەحمەد هاشم و تەحسین ناهید.... هتد ) بوون، ئەم دەستەیەش هەر لەسەرەتاوە ڕەوتی ئەدەبی خۆیان بەوە دیاری کرد کە پەیرەوی (( ڕێچکەی ئەدەبی ڕۆژئاوایی دەکەن و برواشیان بە هونەر بۆ هونەر هەیە )) [٢].

وەك دەریش دەکەوێ زۆربەی نووسەرانی ( فەجری ئاتی ) لەدوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا لە چوار چێوەی ڕێبازی هونەر بۆ هونەر هاتنە دەرەوەو ڕووەو ڕێچکەی ئەدەبی نەتەوەیی هەنگاویان هەڵنا، کە نووسەرانی وەك ( محمد عاكف، يحيى كمال بياتي، چياو گوك ألب، فؤاد كوپرلو )[٣] بوونە ڕابەری ئەو ڕێچکەنەتەوەییەو ئامانجی هەرە دیاریشان بریتی بوو لە گرنگی دان بە زمانی تورکی و بژار کردنی لەوشەی بێگانە و گەرانەوە بۆ کەلتورو سەرچاوەو بنەما نەتەوەییەکان بە مەستی سوود لێ وەرگرتنیان و پارێزگاری کردنیان و گەرانەوە بۆ سەر کێشی هیجای تورکی و خۆدورخستنەوە لە کێشی عەروز [٤]. گومانی تیا نییە کە پیرەمێرد پێش شاعیرانی وەك ( شێخ نوری و گۆران و ڕەشید نەجیب) ئاشنای هەموو ئەو بزوتنەوەو ڕێچکە ئەدەبیانەی تورکی بووە و چێژی ئەدەبی خۆی پێ زاخاو داونەتەوە و لە نزیکەوە زوربەی هەرە زۆری ڕابەرانی ئەو ڕێچکانەی ئەدەبی تورکی ناسیوە، ئەوەتا خۆی دەڵێ: (( لەبیرمە لەدەورەی خولیای شەبابدا کەوتمە ئەستەموڵ، یەکەمجار لە (ئاگە) درواسێی ڕجائی زادە (ئەکرەم بەگ) و (عوشاقی زادە) و (خالد چیا) و (حسێن ڕەحمی ) بووم، ( ڕەزا توفیق )

١ـ ئەحمەد سەلام (وەرگێڕ)، بەشێك لەئەدەبی هاوچەرخ و نوێی تورکی، گۆڤاری بەیان، ژ(٧٩) ی مایسی ١٩٨٢، ل٥٩

٢ـ اكمال الدين احسان، من الادب التركي الحديث: ص٤٢.

٣ـ بروانة: عبداللطيف بندر اوغلو، اشارت اولية في الشعر التركي، الموسوعة الصغيرة (١٢٧)، بغداد، منشورات دار الجاحظ، ١٩٨٣، ص٥١.

٤ـ بروانە: اكمال الدين احسان، من الادب التركي الحديث: ص٤٤.



یشیان پێ ناسیم، کەوتمە بەهەشتی ( سەروەتی فنون) ەوە................ لەم دواییەدا لە ئەستەموڵ دەورەی ئەدەبیاتی تورکی کە شاعیری وەك ( عەبدولحەق حامد، توفیق فیکرت، فائق عالی، ئیسماعیل سەفا، ئەکرەم سلێمان نەزیف، خالید چیا و ئیسماعیل حەقی بابان، نەعیم بەگ، حسین جاهد ) و هەزاران ئەدیب کە ( سەروەتی فنون ) یان لە ئەدەبیاتدا کردبووە خاوەن سەروەت و ڕۆحێکیان پێ دابوو منیش لەدوایانەوە گوڵەچن بووم ))[١].

هەر لێرەوە گومان لەوەناکرێ ئەم پێوەندییەی پیرەمێرد بە ئەدەبی تورکییەوە بۆتە زەمینەیەکی هونەری و ئەدەبی بۆی، تا هەنگاوی ئەدەبی و شیعری لەسەر هەڵنێ و بەرەو جیهانی ئەدەبی ڕابکێشێ تەنانەت وەك خۆشی دەڵێ: گولەچنی شیعری تیادا بکا، بەتایبەتی لەو شیعرانەیدا کە بەتورکی بڵاوی کردونەتەوە [٢].

## ٢ ــ نوێخوازی لە ئەدەبی عەرەبیدا

سەرجەمی لێکۆڵەرانی ئەدەبی عەرەبی میسر بەزەمینەی چەکەرەکردنی نوێخوازی ئەدەبی عەرەبی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە دا دەزانن و ( محمود سامي البارودي ١٨٣٨ــ١٩٠٤م ) یش بە دەنگێکی نوێخوازی ئەو سەردەمە دادەنێن و بەرابەرێکی ئەو قوتابخانەیەی دادەنێن کە بە قوتابخانەی بوژانەوە دەناسرێ و نووسەرانی وەك ( احمد شوقي و حافظ ابراهيم ) یش دەخەنە چوارچێوەیەوە و بەگشتیش ڕێرەوی ئەدەبی و شیعری ئەو قوتابخانەیە رووەو ناوەرۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆوە، ئەگەر چی شێوازی شیعرییان زیاتر شێوازە کلاسیکییەکە بووە [٣].

دوا بەدوای ئەو قوتابخانەیەو ئەو نەوەیە لە شاعیرانی نوێکەرەوە لە ئەدەبی عەرەبیدا لە میسر، نەوەیەکی نوێی تری ئەدەبی هەر لە دەیەی یەکەمی سەدەمی بیستەمەوە لە میسر سەریان هەڵدا و وشیارانە و بە مەبەست روویان لە نوێگەری شیعریی و ئەدەبی کرد بەورادەیەی کە لە ساڵی (١٩٢١ز) دا

١ـ ڕۆژنامەی ژین، ژ(٩٦٧) ی ١٩٤٩/٦/٢

٢ـ بروانە: سلیمانیەلی توفیق، کاروان غم، گۆڤاری ژین (ئەستەمول ) ژ(٥) ی کانوونی دووەمی ١٣٣٤، ل٧

٣ـ بروانە: د. محمد عبدالعزيز الكفراوي، تأريخ الشعر العربي، القاهرة، دارالنهضة للطباعة والنشر، ١٩٧١، ص١٦٩.
هەروەها بروانە: د. عبدالعزيز الدسوقي، جماعة ابولو واثرها في الشعر الحديث، ج١، القاهرة، شركة الامل للطباعة والنشر، ٢٠٠٠، ص٥.

وەك قوتابخانەیەكی ئەدەبی بەناوی ( الديوان ) خۆیان ناساند كە رابەرە دیارەكانی بریتی بوون لە (عباس محمود العقاد، ابراهيم عبدالقادر المازني، عبدالرحمن شكري ) [1]. بەلای( عباس محمود العقاد) ەوە شیعر دەبێ هەڵگری گیانی سەردەمەكەی بێت و رەنگ پێدەرەوەی گۆرانكارییەكانی سەردەم بن، هەر بۆیە یەكێتی دەقی شیعری بە بنەمایەكی گرنگی دەق دادەناو بەلایەوە هەركاتێك پاش وپێش بە بەیتی دەقێك بكرێ ئەوا ئەو دەقە یەكێتی لە دەست دەدات، بەگورینی زمانی شیعریش لەلایان وێنە ی شیعریش گۆرانی بەسەردا هاتوو لەژێر چەمكێكی رۆمانسیانەدا وێنەكان بنیات نراون، لە روی بەكار هێنانی قافیەشەوە چەند جۆرە قافیەیەكی نوێیان بەكار هێنا وەك جوت قافیەو قافیەی رەهاو قافیەی بەرامبەر[2].

وەك ئاشكرایە لایەنێكی دەنگی نوێخوازیانەی قوتابخانەی دیوان بانگەشە كردنیان بوو بۆ شیعری هاوچەرخ بەو شێوەیەش لە هاوچەرخێتیان دەروانی كە ( عباس محمود العقاد) سەرنجی بۆ راكێشاوەو رای وابووە كە ((مەرج نییە شاعیرێك كە باس لە فرۆكە بكا ئیتر بە شاعیرێكی هاوچەرخ دابنرێ و ئەو شاعیرەیش كە وەسفی حوشتر بكا بە شاعیرێكی كۆن دابنرێ چونكە نوێخوازی لە شیعرا بریتییە لە چونیەتی وەسف و دیدی نوێی شاعیربۆ ژیان))[3]، هەر ئەم تێروانینەی قوتابخانەی دیوان گوێزرایەوە بۆ لای شاعیرانی وەك (رەسافی و زەهاوی) ش لەعیراقدا، بەتایبەتی زەهاوی[4].

دیارە لەپاڵ ئەو رێچكە نوێگەریەی ئەدەبی عەرەبی لەمیسر نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ كە لە عیراقیش خواستی نوێگەری لە دەیەی یەكەمی سەدەی رابردوووەوە لای شاعیرانی وەك ( جميل صدقي زەهاوی و معروف رصافي ) سەری هەڵدابوو بە تایبەتی لای ( زەهاوی ) بۆ ماوەیەك روەو تاقیكردنەوەی شیعری بێ قافیە هەنگاوی هەڵناو بەو هەنگاوەشی گۆمێكی مەنگی ئەدەبی لەو سەردەمەدا شڵەقاند [5].

هەر لێرەوە بۆ ئەوە دەچین كە بایەخ دانی پیرەمێرد و بانگەشەكردنی بۆ شیعری (عصری ) ئاكامی كاریگەر بوونی بووە بە شیعری عەرەبی ئەوسەردەمە بەگشتی و تێروانینەكانی زەهاوی بە تایبەتی، ئەوەتا لەم روو وەوە پیرەمێرد دەربارەی شیعری (عصری) دەڵێ: (( ئەم بەینە كە هاتمەوە

١ـ بروانە: عبدالقادر القط، حركة الديوان واثرها في النقد الادبي والشعر، بغداد، دار الحرية للطباعة، ١٩٨٩، ص٣.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ص١٦ـــ٢٦.

٣ـ د. كريم الوائيلي، تدفق الينبوع قراءة نقدية في مدرسة الديوان، سايت ( مينشاوي) ( انترنيت).

٤ـ بروانە: عباس توفيق، نقد الشعر العربي الحديث في العراق من ١٩٢٠ ـ ١٩٥٨: بغداد، دار الرسالة للطباعة، ١٩٧٨، ص١٥٥.

٥ـ سەرچاوەی پێشوو: ص١١.



ئاورم دایەوە چوارلام پربوو لە شاعیر، ئەم كوڕە خۆی منداڵە و شیعری پیرە، بەڵام لە كەمەندی قافیە دا ئەسیرە، ئەمەوێ شیعری سەربەست و عەسری بنووسن )) [1].

دیارە گومان لەوە ناكرێ كە پیرەمێرد نەك هەر ئاگاداری بەرهەمەكانی ( زەهاوی و رەسافی ) یش بووە، بەڵكو پێوەندی راستەوخۆی بە (زەهاوی) ویشەوە هەبووە، هەربۆیە شیوەنێكی شیعریی بۆ كۆچی دوایی (زەهاوی) دەگێڕێ:

**سەد سالی تر بپرسی: جەمیل سدقی وا لە كوێ ؟**
**دەنگی بلّندی خۆی، لەهەموو شیعرێ دێتە گوێ**
**نالێم كە هەیكەلێكی ببێ، وێنە ، مردووە**
**دیوانی شیعری چاكترە، ناودارە، زیندووە**
**پێرار بەشیعری ئەوبو، كە فیردوسی ناسرا**
**فیردەوس بووە هەوای دوو فیردەوسی وەك برا**
**كاكە جەمیل بە یادی جەمیلت بوو شیعرم هات**
**راوەستە زۆری ناوێ وەختە منیش بێمەلات** [2]

## ٣ـــ نوێخوازی لە ئەدەبی فارسیدا

وەك ئاشكرایە شۆرشی مەشروتەی ئیران لەساڵی (١٩٠٥ز) دا زەمینەیەكی لەباری بۆ گۆرانكاری سیاسی و ئابوری و كۆمەڵایەتی و رۆشنبیری رەخساندو بوارێكی لەباری بۆ گۆرانكاری و نوێكردنەوە لە ئەدەبی فارسیدا رەخسان بەتایبەتی لای شاعیرانی وەك ( عارفی قەزوینی و بەهارو عیشقی و لاهوتی) كە لە پاڵ خۆ دوور خستنەوە لە بابەتی دلّداری و ستایش بەرەو بابەتی نیشتمانیو كۆمەڵایەتی هەنگاویان هەڵنا [3]، (( نیشتمان بۆ خۆی بووە ئەو تەوەرەی كە شاعیرانی كۆدەكردەوەو غەزەلەكان بوون بە غەزەلی نیشتمانی و لە

١ـ رۆژنامەی ژین، ژ(٥٦٠) ی ١٩٣٩/٣/١٦.

٢ـ دیوانی پیرەمێرد بەرگی یەكەم، فایەق هوشیار و هاورێكانی، بەغدا وەزارەتی رۆشنبیری، ١٩٩٠، ل٢٩٢. هەر ئەم دیوانەی پیرەمێردمان كردووە بە سەرچاوەیەكی سەرەكی لێكۆڵینەوەكەمان لەگەڵ سوود وەرگرتن لە دیوانەكانی تری پیرەمێرد و شیعرە بڵاوكراوەكانی لە رۆژنامەو گۆڤارەكاندا.

٣ـ محمد رچا شفيع كدكني، ادوار شعر فارسي، انتشارات توس، ١٣٥٩، ل٣٦.

بازنەی ئافرەت و خۆشەویستی ئافرەت چوونە دەرەوە، دیارە ئەم هەنگاوەش بۆ خۆی هەنگاوێکی ناسیونالیزمانەی شاعیران بوو کە پێشتر بەم شێوازە نەدەبینرا، بەواتایەکی تر لەم قۆناغەدا ڕێرەوێکی نوێ لەبەردەم شیعری فارسیدا کرایەوە کە ئەویش ڕێرەوی ناسیونالیزمی بوو ))[1]، هەر لەچوار چێوەی ئەورێرەوە شیعرییەشدا بوو کە بایەتێکی دیاری تری شیعریی کە بابەتی سروشت و وەسفی سروشت بوو گۆرانی بە سەردا هات و ڕاستەوخۆ برایە ناوبازنەی شیعری سیاسی و شیعری نیشتمانییەوە [2]، ئەم هەنگاونانەشیان دیارە بۆ خۆی کەم و زۆر لە ژێر کاریگەری ئەدەبی ئەوروپیدا بووە کە لەوسالأنەدا دەرگای هاتنە ناوەوەی ئەدەبی ئەوروپی بۆ ناو ئەدەبی فارسی تارا دەیەك والأ کرابوو [3].

هەر بەکردنەوەی ئەودەرگایەش دەنگە نوێخوازەکانی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی لەوەلأمی ئەو نووسەرانەی کە پارێز گاریکەری ڕێچکە کلاسیکیەکەبوون دەیان وت:(( قوتابی مامۆستا پەرست هەرکاتێ تیروانینی بەرەو ئەوە بچێ کە سەعدی بۆ سەردەمی خۆی بەرز و بێ وێنە بووە، ئەوا دروستەو لێی قوبولّ دەکرێ، بەلأم هەرکاتێ بیەوێ بلّێ ئەمرۆش دەتوانین ئەو بیروڕایانەی سەعدی بکەینە فریاد ڕەس بۆمان، ئەوا لێی قوبولّ ناکرێت وەلأم دەدرێتەوە )) [4].

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە ئەم ڕێچکە نوێیەی شیعری فارسی لەچارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بە دەسەلأت گرتنە دەستی( ڕەزا شا) کۆتایی پێ هات هەر بۆیە ئەو سەردەمە بە قۆناغی مت بوون و سربوونی شیعر و هەولّەکانی نوێخوازی شیعریی دادەنرێ [5]. لەگەلّ ئەوەشدا دیاردەیەکی دیاری ئەم سەردەمە دەنگی شانازی کردنی شاعیران بوو بەرابردووی ئێرانەوە کە سیاسەتی ( ڕەزا شا ) ش لەم ڕوو وەوە پشتگیری لێ دەکردن کە بۆ خۆی بووە ڕێرەوێکی نەتەوەیی لە ئەدەبی فارسی ئەو قۆناغەدا [6] و(( بەگشتی شیعری ئەم قۆناغە لەدەوری چەند بابەتێکی شیعریدا سوراونەتەوە کە بریتی

---

١ـ محەمەد ئەمین محەمەد نوری ئەمین، شەقلی نوێخوازی لە شیعری کوردی و فارسی سەدەی بیستەمدا، ( نامەی ماجستێر)، زانکۆی سلێمانی ــ کولێجی زمان، ٢٠٠٤، ل١٣.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ل١٧.

٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ل١٨.

٤ـ یحی ارین پور، ازصباتا نیما، تأریخ (١٠٥) ساله ادب فارسی، جلد اول، انتشارات زوار، چاپ گلشن، چاپ هفتم، ١٣٧٩، ل٤٤٠.

٥ـ یحی ارین بور، از نیما تا روزگار ما، چاپ سوم، تهران، انتشارات زوار چاپ گلشن، ١٣٧٩، ل١٧٦.

٦ـ محمد رچا شفیع کەدکنی ادوار شعر فارسی ـــ ازمشروگیت تا سقوگ سلگنت: ل٥١.



بوون لە: وەسف، مێژوویی، نیشتمانی، سیاسی، ئەخلاقی، پەوەردەیی، پیشەسازی، سەردەم، سوشیالیستی یا کارگەری..... دیارە هەریەك لەم بابەتانەش بۆ خۆیان بارودۆخە سیاسیەکە شەقلّی جیاجیای پێ پۆشیوون بەتایبەتی شیعری نیشتمانی کە تا رادەیەك جیا بوو لەو شیعرە نیشتمانیانەی سەردەمی مەشروتە، چونکە نیشتمان پەروەری لەم قۆناغەدا بەرەو ڕێرەوێکی نەتەوەییانە برا..... هەر ئەم ڕێرەوەش بوو کە شاعیران و نووسەرانی بەرەو لێکۆلّینەوەی مێژوویی و شیعری مێژوویی بردو دەنگی شانازی کردن بە رابردووی ئێرانەوە بوە دەنگێکی دیاری شیعریی لەم سەردەمەدا کە سیاسەتی (ڕەزاشا) ش پشتگیری لێ دەکرد )) [1].

هەر لێرەوە کە بمانەوێ کاریگەری ئەدەبی فارسی بەگشتی و ئەم بزوتنەوە نوێیانەی ئەدەبی فارسی لەسەر پیرەمێرد دەرخەین ئەوا ڕاستەوخۆ ڕووبەڕوی ئەو ڕاستییە دەبینەوە کە پیرەمێردیش وەك هەر ڕۆشنبیرێکی قۆناغەکەی خۆی دابراو نەبووە لە ئەدەبی فارسی، هەروەك خۆی لە نووسینێکیدا دەلّێ: (( شاعیری مەشهوری تورك ( عبدالحق حامد ) کە شاعیرێکی ئاسمانی بوو، کە لە ئەستەمولّ لە دەوری ئەخیری پاش ئینقلاب هەموو ئێواران لە خزمەتیا ئەبووم، لە زۆر مصاحەبەدا بۆی مەعلووم بوو بوو کە من هەندێ لە ئەدەبیاتی فارسی شارەزام، ڕۆژێکیان غەزەلێکی فارسی خۆمم بۆ خوێندەوە، فەرمووی ئەهلی سلێمانی لە کوێوە فێری ئەم فارسییە ڕەوانە شیرازییە بوون ؟ وتم، لە قەدیمەوە تەحسیلی ئێمە فارسییە، زۆر تر بە شیعری حافڤ و سەعدی ڕاهاتووین و حەتتا ئیعتقادێکی وامان بە (حافظ) هەیە کە کارێکی عاقیب مەجهولمان ببێ کتێبی خواجە حافظ ئەگرینەوە))[2].

هەرچی دەربارەی ئاگادار بوونی پیرەمێرد و کاریگەر بوونیشیەتی بە بزوتنەوە ئەدەبییەکانی کۆتایی سەدەی نوۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و دواتری ئەو ئەدەبە ئەوا ئەو ڕاستیەمان لەبەر دەستدایە کە پیرەمێرد نەك هەر خوێنەری ڕۆژنامە و گۆڤارە فارسییەکانی ئەو سەردەمەبوون، بەلّکو شیعریشی تیا بلأوکردونەتەوە، ئەوەتا خۆی دەلّێ: (( ئەو سەردەمە کە ڕۆژنامەی ( شەفەقی سورخ)و مجەلەی (فەرهەنگ ) لە تاران دەردەچوو هەمیشە من لە ئەستەمولەوە مەقالە و شیعرم بۆ ئەناردن))[3].

---

١ـ محەمەد ئەمین محەمەد ئەمین، شەقلّی نوێخوازی لە شیعری کوردی و فارسی سەدەی بیستەمدا (نامەی ماستەر): ل٤٥.

٢ـ ئومید ئاشنا، پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی، بەرگی یەکەم، هەولێر، دەزگای ئاراس، ٢٠٠١: ل٢١

٣ـ ڕۆژنامەی ژین، ژ (٨٥٥) ی ١١/کانوونی دووەمی / ١٩٤٧.

بەم پێیە دەکرێ هەوێنی ئەو کاریگەربوونەی پیرەمێرد بە ئەدەب و شیعری فارسی نوێوە نەك هەر لە بەرهەمە شیعرییەکانیدا بەدی بکەین بەڵکو لە بایەخدانیشدا بە رووکردنە مێژووی کورد و ئەو سەرگوزشتە و چیرۆکانەی کە سیما و شەقڵی نەتەوایەتیان پۆشیوە بەدی دەکرێن [١].

## ٤ــ نوێخوازی لە ئەدەبی کوردیدا

تێروانینێکی باو و گشتی دەربارەی رێرەوی نوێکردنەوە لە شیعری کوردیدا ئەو تێروانینەیە کە بەلایەوە سەرەتای نوێگەری لە شیعری کوردیدا لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دەست پێ دەکات کە بۆ خۆی بەسەردەمی پاشەکشێی رێبازی کلاسیکی و سەرهەڵدنی رێبازی رۆمانتیکی دادەنرێ و لەپاش جەنگی دووەمی جیهانیشەوە رێبازە رۆمانتیکییەکە بەرەو دواوە دەچێت و ریالیزمی جێگای دەگرێتەوە [٢].

لە پاڵ ئەم تیروانینەدا ئەو بۆچوونەش بەدی دەکرێ کە ( حاجی قادری کۆیی ) بە سەرەتای نوێبوونەوەی شیعریی دەزانن، ئەوەتا لەم رووەوە ( حمە صدیق عارف ) ڕای وایە کە شیعری کوردی لە دوای قوتابخانەی بابانەوە پێی ناوەتە ناو قۆناغی نوێبوونەوەوە، ئەم قۆناغەش بەماوەی گواستنەوە ناو دەبات و ( حاجی قادری کۆیی ) بە یەکەم هەنگاوی ئەو گوێزانەوەیە دەزانێت، هەنگاوی دووەمیش بەلای ( محمد صدیق عارف ) ەوە لەلایەن شاعیرانی وەك ( پیرەمێرد و ئەحمەد موختار جاف و بێکەس و زێوەر و وەلی دێوانە ) وە نراوە و تا شەری دووەمی جیهانی خایاندووە، هەرچی هەنگاوی سێیەمیشە ئەوا بەلایەوە لە ( گۆران ) ەوە دەست پێ دەکات و ( هەردی و دیلان و هەژار و ع. ح. ب. و کامل ژیر و دڵدار و بەختیار زێوەر ) بە پەیرەوی کەری ئەو هەنگاوە دادەنێ [٣].

وەك دیارە ئەم بۆ چوونەی ( محمد صدیق عارف ) تارادەیەك جیاوازە لەو بۆچوونە باوەی تری کێشەی نوێگەری لە ئەدەبی کوردیدا کە ( شێخ نوری و گۆران و رەشید نەجیب و پیرەمێرد ) بە رێچکەکەرەوەی نوێگەری لەشیعری کوردی دادەنێن بە تایبەتیش ( شێخ نوری و گۆران ) هەروەك (

١ـ بۆ نموونە بروانە: پیرەمێرد، دوانزە سوارەی مەریوان، سلێمانی، چاپخانەی ژین، ١٩٥٩.

٢ـ بروانە: د. عزالدین مصطفی رسول، الواقعیە فی الادب الکردی، صیدا ــ بیروت، منشورات دار المکتبە المصریە، ١٩٦٦، ص١٠٥.

٣ـ محمد صدیق عارف، کامەران و هۆنراوەی نوێ، بەغدا، چاپخانەی مەعاریف، ١٩٥٨، ل١٩.



رەفیق حیلمی ) دەربارەی ( شێخ نوری شێخ سالح ) دەڵێ: (( ئەوانەی کە ئیمڕۆ خۆیان بە دامەزرێنەری قوتابخانەی شیعری تازە ئەژمێرن ئەبێ بزانن کە یەکەم بەردی بناغەی قوتابخانەکەیان لەلایەن نووری شێخ صالحەوە دامەزرا )) [١]، دەربارەی ( گۆران ) یش دەڵێ: (( لە شیعری کوردیا ئینقلابێکی گێڕاوە بەم ئینقلابە قوتابخانەی شاعیرە کۆنەکانی بەتەواوی رووخاندووە وە دونیای شیعری کلاسیکی بەجارێ سەرەوژێر کردووە ))[٢].

دەربارەی ئەم رۆڵەی ( شێخ نوری و گۆران ) یش لە کردنەوەی رێچکەی نوێگەری لە شیعری کوردیدا گۆران خۆی دەرگای ئەو باسەی کردۆتەوە کە سەرەتای ئەو نوێگەرییە بەلاسایی کردنەوەی ئەدەبی تورکی دەستی پێ کردووەو ئەوەتا خۆی دەربارەی ئەو رێچکەیە دەڵێ: (( نووسەر و شاعیرانی ئەوسا بە تایبەتی شێخ نووری و رەشید نەجیب و من کە پێکەوە بە ئەدەبی تورکی موتەئەسیر بووین و پێکەوە ئەمان نووسی، بەلام تەنها شێخ نووری شیعرەکانی بلاو ئەکردەوە و من بلاوم نەئەکردەوەو ئەو لەم بارەیەوە نەشاتی دەرئەکەوت، وە ئەدەبی تورکی قوتابخانەی شیعری تازەی تیا پەیدا بوو بوو کە پێیان ئەوترا ( ئودەبای فەجری ئاتی ) لەوان ( توفیق فکرەت ) و ( جەلال ساهر ) بوون.... وە ئەدیبێکی تری تورك کە ( عبدالحق حامد ) ە ئەگەرچی لەم کۆمەڵەنەبوو، بەلام دیسان هەرپێی موتەئەسیر بوین، کەوابێ هەموومان بەیەکەوە ئەمان روانیبیە یەك کلاو رۆژنە، بەلام ئەتوانرێ بەشێخ نووری بووترێ سەرۆك بەهۆی: زۆری بەرهەمی، بلاوکردنەوەی بەرهەمەکەی کە بێگومان تەئسیری ئەبەخشییە سەر ئەدەبی کوردی )) [٣]. دەربارەی شیعرەکانی خۆشی گۆران دەڵێ: (( بەشی زۆری کۆنەکان بەوەزنی عەروزە کوردیەکی کۆنی تێکلاو بە زمانی بێگانە نووسراون ئوسلوبیشیان کۆنە یان وەك هی سالم و نالی لەسەر پێ و شوێنی غەزەل هەڵبەستراون یان ئەو جۆرە ئسلوبەیان تێدا کراوە بەسەر مەشق کە مامۆستا ( م. نووری ) و هاورێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی عوسمانیان وەرگرتو لەسەر دەمێکی سنووردارا ( ١٩٢٠ ــ ١٩٣٠ ) شیعری کوردی ناوچەی سلێمانیان پێ تازە کردەوە، شیعرە تازەکان بە وەزنی پەنجە (هجا) هەڵبەستراون کە هەر چەند شیعر دۆستەکانی کۆن بە خوێندنەوەی رانەها توون، بەلام لەبەر ئەوەی وەزنی تایبەتی نەتەوەیی مانە وە لەگەڵ خەسائیسی

١ـ رەفیق حیلمی، شیعرو ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی دووەم، بەغدا، چاپخانەی الشباب، ١٩٥٦، ل٢٠٦.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/١٥٣.

٣ـ عبدالرزاق بیمار، دانیشتنێك لەگەڵ ــ گۆران ــ دا، گۆڤاری بەیان، ژ (٢) ی شوباتی ١٩٧٠، ل٣

زمانەکەمان چاکتر ڕێك ئەکەوێ بەپێویستم زانی لەماوەی تەقەلای ئەدەبی خۆمان ڕۆژ بەڕۆژ بەرەولایەنی بەکارهێنانی ئەم وەزنە بچم )) [١].

( د. دلشاد عەلی ) لەو وتەیەی گۆرانەوە ئەوتێروانینانەی هەلێنجاوە و خستویەتیە بەردەست: (( تەمەنی شیعری (گۆران ) تا ساڵی ١٩٥٠ بە دوو قۆناغی داهێناندا تێپەریوە کە خۆی بەرهەمەکانی ئەو دوو قۆناغەی بە (کۆن) و (تازە) لێك جیاکردۆتەوە. بەرهەمە کۆنەکان دوو چەشنن، یان وەك خۆی دەڵێ دوو شێوازیان تیا پەیرەوی کراوە: شێوازی کلاسیکییەکەو ئەو شێوازەی کە( شێخ نوری) بەکاریگەری ئەدەبی تورکی هێنایە ناو شیعری کوردییەوە، بە واتایەکی تر بەرهەمە (کۆن) ەکان دوو جۆرن: ئەوانەی لاسایی شیعری کلاسیکی کوردیان کردۆتەوە و ئەوانەشی کە لاسایی ڕێرەوەکەی شێخ نوریان کردۆتەوە. ڕێچکەشیعرییەکەی ( شێخ نوری ) و هاوڕێکانی تەنها دەساڵێك کراوە بووە کە ساڵانی نێوان (١٩٢٠-١٩٣٠) بووە. دوای ڕێچکەکەی( شێخ نوری ) ڕێچکەیەکی شیعری نوێ کراوەتەوە کە گۆران بەتازە ناوی دەبات. شەقڵی هەرە دیاری ڕێچکە (تازە) کەش کە جیای دەکاتەوە لە(کۆن) ەکە بەکارهێنانی کێشی بڕگە یی بووە و( گۆران) خۆی ڕەنگی هێنانە ناوەوەی بۆ ڕشتووە، هەر بەو ڕەنگ ڕشتنەی کێشە بڕگەییەکەش لە ڕێچکەکەی (شێخ نووری ) جیا کردۆتەوە))[٢].

بەم پێیە ( د. دلشاد عەلی ) دوو ڕێچکەی نوێکردنەوە لە شیعری کوردیدا دیاری دەکات ڕێچکەی یەکەمیان: ئەو ڕێچکەیە بووە کە بەکاریگەر بوون بە ئەدەبی تورکییەوە لەلایەن ( شێخ نوری شێخ سالح ) ەوە لەماوەی ساڵانی ( ١٩٢٠ ــ ١٩٣٠ ) دا کرایەوەو ( گۆران و ڕەشید نەجیب ) یش لەو ماوەیەدا پەیرەویان کردووە، ڕێچکەی دووەمیش: ئەو ڕێچکە یە بووە کە ( گۆران ) لەدوای ساڵی (١٩٣٠ ) ز یەوە کردویەتیەوە کە بۆ خۆی ڕێچکەی خۆداماڵین بووە لە ئەدەبی تورکی و بەرەو ڕەسەنایەتی چوون بووە هەروەك ( د. دلشاد عەلی ) دەڵێ: (( ڕووکردنە کێشی بڕگەیی لەلایەن (گۆران) ەوە ئەنجامی گەران بووە بەدوای ڕەسەنایەتی داو ئەکامی هەوڵی (گۆران) خۆی بووە لە پێناو داماڵینی سیمای ئەدەبی تورکی لە شیعری کوردی بیستەکانی سەر بە ڕێچکەکەی ( شێخ نوری )و

---

١ـ دیوانی گۆران، محمدی مەلا کەریم کۆی کردۆتەوەو ئامادەی کردووە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، بەغدا، چاپخانەی کۆری زانیاری عیراق، ١٩٨٠، ل٣.

٢ـ د. دلشاد عەلی، گۆران داهێنان و نوێخوازی ــ لێکۆڵینەوەیەکی سایکولۆژی، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، ژ (٢٠) حوزەیرانی ٢٠٠٧، ل٤٦.



بەخشینی شەقڵی کوردانە بە شیعری کوردی لەکرمانجی خوارووداا، دیاریشە کە دەیزانی ئەو شەقڵە کوردانەیە تەنها بە ڕووکرنە کێشی بڕگەیی بەدی نایەت بۆیە ڕووی لە گورینی قافیە و زمانی شیعری‌و وێنەی شیعری و چێژی شیعریش کرد تا پەرییەکی شیعری کوردی پێ لە دایك بێت )) [١].

بێگومان چ ئەم ڕێچکانەی نوێخوازی لەشیعری کوردیدا بن کە لە بیستەکان و سییەکانی سەدەی ڕابردوو دا لە ژێر کاریگەری گۆرانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکاندا کرایەوە، چ ئەدەبی نوێی تورکی و عەرەبی و فارسی ئەوسەردەمە بووبن، تارادەیەکی زۆر بوونە هۆی ئەوەی کە دەنگی ئەو شاعیرانەش بگۆرن کە پەیرەویکەری ڕێبازە کلاسیکییەکەی شیعری کوردی بوون وەك لەبەرهەمەکانی ( زێوەر و ئەحمەد موختار جاف و حەمدی ) دا بەدی دەکرێ [٢].

بەم پێیە نوێگەری وەك ڕێچکەو وەك خواستی تاکە کەسیش ئاکامی ئەوکەشە ڕۆشنبیرییە نوێیە بووکە بەهۆی پێوەندی کردن بە ئەدەبی نوێی میللەتانی دراوسێوە ڕەخسابوو، هەر لەناو ئەو کەشە ڕۆشنبیرییەشدا بوو کە دەنگی ڕەخنەی کوردی بەبانگەشەکردن بۆ نوێگەری دەستی پێ کرد هەروەك لەو وتارەدا دەبینرێ کە بەناونیشانی (شاعیرەکانمان ) ەوە بەناوی ( سیاپۆش ) ەوە لە ڕۆژنامەی(ژیان)ی (١٩٣٢) دابلاوکراوەتەوە ڕاشکاوانە داوای نوێکردنەوەو نوێگەری دەکا لە شیعری کوردیدا و دەڵێ:((خۆتان شیعری کوردی بخوێننەوەو بزانن چۆن لەگەڵ ئەو وەسفی شیعرەی کە بۆم کردن ئەگەر لە (وتنێکی وەزن داری قافیەدار ) زیاتر تان دی بلێن هەیەتی، ئەگینا ئێوەش لەگەڵ من بلێن کورد شیعرێکی وای نییە کە لە ئەدەبیاتی عالەمدا شوێنێکی ببێ یا یا شایان بێت، ناڵێم هەر شیعرمان نییە بەلێ هەندێکمان هەیە بەلام وەك گوڵە ئەستێرە بەشەو پێی ئاوزی ئاگر یەعنی ناتوانین لەبەر چاوی دۆست و دوژمن خۆمانی پێوە هەلکێشین )) [٣].

---

١ـ د. دلشاد عەلی، گۆران داهێنان و نوێخوازی ــ لێکۆڵینەوەیەکی سایکولۆژی، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، ژ (٢٠) حوزەیرانی ٢٠٠٧، ل٤٨.

٢ـ بروانە: محمد فاضل مصطفی، زێوەر ژیان و بەرهەمی ( نامەی ماستەر )، هەولێر، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٩، ل٢٢. هەروەها بروانە: دیوانی ئەحمەد موختار جاف، ئامادەکردن و بەراوردکردن و لێکدانەوە و پێشەکی بۆ نووسینی ( د. عیزەدین مستەفا ڕەسول )، بەغدا، چاپخانەی الادیب، ١٩٨٦، ل٣٣. هەروەها بروانە: ( د. عبدوڵلا خدر مەولود، لێکۆڵینەوەیەك لەشیعری حەمدی، هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری، ٢٠٠٤، ل١٧.

٣ـ سیاپۆش، شاعیرەکانمان، ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٣٣٦) ی ٢٥ أغستوس، ١٩٣٢

بەم پێیە کەشە رۆشنبیرییەکەی ئەوسەردەمە رێگای خۆش کرد بۆ ئەو رێچکە نوێخوازییەی کە گۆران لە سییەکانی سەدەی رابردوودا کردیەوەو لە چلەکان و پەنجاکاندا شاعیرانی تری لە خۆ گرت کە دیارە بەلای ئێمەوە ئەم رێچکەیەش ئەو رێچکەیەیە کە بەشیعری نوێی کوردی دەناسرێ.

## ب ـــ دیدی نوێخوازیانەی پیرەمێرد

وەك ئاشکرایە بواری نوێخوازی لەئەدەبدا پێوەندی راستە وخۆی بەهەمان بیرەوە هەیە لەبوارەکانی تری ژیانداو دەبنە کار لێ کەرو کارلێ کراوی یەکتری، ئەدیبی نوێخواز دەبی سیاسییەکی نوێخواز و رۆشنبیرێکی نوێخواز و تاکێکی کۆمەڵایەتی نوێخوازیش بێت، هەر بۆیە هەر کاتێ بمانەوێ لە رۆڵی نوێخوازیانەی پیرەمێرد لە بواری شیعریدا بدوێین دەبێ ئاگاداری دیدی نوێخوازیانەی پیرەمێردیش بین لە بوارەکانی تری ژیاندا، بەم پێیەوپێش ئەوەی باس لە پێگەو پلەی پیرەمێرد بکەین لە بزوتنەوەی نوێخوازی شیعری کوردیدا هەوڵ دەدەین روو لە تیروانینە نوێخوازیەکانی بکەین بەتایبەتی لەبواری سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریدا.

گومانی تێدا نییە کە پیرەمێرد یەکێك بوو لە روناکبیرە کوردە هەرە دیارەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم و یەکێك بوو لەو سەردەستانەی کە لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا رەنگ رێژکەری گۆرانکارییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردەواری بوون، ئەو گۆرانکاری یانەی کە ( د. کەمال مەزهەر ) لەوسەردەمەدا بە (رێنسانس) ناوی دەبات و دەربارەی رابەرانی ئەو رێنسانسەش دەڵێ: ((لە خۆڕا نەبوو پێشەنگی دەستەی روناکبیری چەرخی بوژانەوەی کورد لەگەلێك دەرگایان دەدا تیایاندا هەبوو لەیەك کاتدا زانای ئایینی و ئەدیب و مێژوو نووس و رۆژنامە نووس و پیاوی کۆمەڵ و سیاسەت بوو، قازی موحەمەد جەلادت بە درخان و مەلای گەورە و ئەمین زەکی و پیرەمێرد و حسین حوزنی موکریانی و رەفیق حیلمی لەوکەڵانەی کوردن کەوەك نەمرانی رۆژگاری رێنسانس، لە پێناوی وریاکردنەوەی گەلدا بۆیان بکرایە خۆیان دەکرد بەکونی دەرزیدا))[1]، کەواتە پیرەمێردیش یەکێك بوو

١ـ د. کەمال مەزهەر، رێنسانس، وەرگێرانی فۆاد میسری، بەغدا، چاپخانەی الحوادث، ١٩٨٤، ل٣



لەو روناکبیرە دیارانەی کە نوێخوازانە لە گەلێ دەرگای داوە، چ دەرگای سیاسەت بووبێ یان کۆمەڵایەتی بووبێ یا رۆشنبیری بووبێ کەدەکرێ بە جیا جیا باسیان لێوە بکەین.

### ١ـــ پیرەمێرد لەبواری سیاسەتدا

لێرەدا سەرەتا دەکرێ لەوراستییەوە بچینە ناو ئەم دەرگایەی ژیان و تیروانینەکانی پیرەمێردەوە کە پیرەمێرد تالە ژیاندا بوو بە کەسێتییەکی نا تەبا لەگەڵ پارتە سیاسییەکانی ئەو قۆناغەدا دەبینرا، ئەم ناتەباییەش بۆ خۆی ئاکامی لاتەریك کردنی بوو لەلایەن پارتە سیاسییەکانی سەردەمەکەیەوە کە بێگومان خوێندنەوەیان بۆ پیرەمێرد لەو سەردەمەدا خوێندنەوەیەکی دۆستانە نەبووە بەورادەیەی کە بۆ زۆرکەس دەرکەوتووە خوێندنەوەیەکی ناراست بووە نەدەبوو بەو شێوەیە رەفتار لەگەڵ پیرەمێردا بکرێ کە کراوە، ئەوەتا ( محەمەدی مەلا کەریم ) لەم بارەیەوە دەڵێ: (( من پیرەمێرد بەرۆشنبیرێکی وای کورد ئەزانم بەش بەحاڵی ئەو قۆناغەی تیاژیاوە، ئەگەر زۆرتری رۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی کورد هەر لەسەرەتاوە یا هیچ نەبێ لە هەندێ هەڵکەوتی گەورەی مێژوییەوە، لەم یا لەو پارچە لە پارچەکانی کوردستانا، شوێن پێی قوتابخانەی بیری ئەویان هەڵبگرتایە و بەو پێیە بجولاّنایەتەوە تا ئێستا لەرێگایەکی هێدی و کەم مەینەتترو واقعی ناوخۆ و دەوروبەری نزیك و دوور بەدیکردووانەترەوە، گەلێ لە ئێستا زیاتر و زۆرتر بۆ پێشەوە رۆیشتبووین زۆر لە پێویستیەکانی ئەم قۆناغەی ژیانی کوردەواریمان دەستە بەرکرد بوو ))[1] , دیارە خوێندنەوەی بیری پیرەمێرد چ ئەوسا بووبێ چ ئێستا هێندە گران نییە کە نەتوانرێ راستە و راست پەی بە بیری سیاسیانەی نەبرێت چونکە چ تێروانینە سیاسیەکانی بووبن یان هەڵوێستە سیاسییەکانی بووبن بۆ خۆیان رەنگ پێ دەرەوە و بەرجەستە کەری بیروو سۆزی نەتەوەییانەی پیرەمێرد بوون، هەرئەمەش بوو بەهۆی ئەو چەشنە تیروانینە نادروستە بۆ پیرەمێرد کە بە شێوازی جۆرا و جۆر دەخرایە روو، رەنگە لێرەدا بوترێ کە ئەو چەشنە دژایەتی کردنەی پیرەمێرد بێ بنەمانەبوون، چونکە هەندێ جار ویستویەتی گیانی راپەرین و بەکۆڕدا چوونەوە لەناو لاواندا سستەو خاو بکاتەوە بەوپێیەی لەوتارێکی ساڵی (١٩٤٨) دا دەڵێ: ((غەمخواری یەکتری بین و هەریەکە بەلایەکداو بەخرافاتی هیچ و پوچ هەڵنەخەلەتێین و تەنها لە کاروباری میللەتی خۆماندا عەلاقەداربین‌و دەخلێکمان بەسەر سیاسەتی بێگانەوە نەبێ، نەخوازەلا سیاسیەت بۆتەلەبە ژەهرێکی کوشندەیە، تاقیکراوەتەوە کاتێ گەردش گێرەکانی سیاسەت کە خۆیان بۆیان نەچووە سەرو لە مەنفەعەتی

١ـ محەمەدی مەلا کەریم، بیری کۆمەڵایەتی و سیاسی پیرەمێرد، بەغدا، چاپخانەی دارالحریە، ١٩٩٢، ل٧ـــ٨.

شەخسی خۆیان تێشکان، ئینجا ئەبنە شەیتان و ئەچنە کلێشەی لاوە خوێن گەرمە جگەرگۆشەکانمانەوە، هەی ئێمە ئەوەمان بوێ و ئەمە داوا بکەین تا ئەیان خەنە سەر رێی سیاسەت، ئەوانیش بە چاکی ئەزانن، لەگەڵ ئەمەدا کە هێشتا شارەزای هیچ سیاسەتێ نەبوون، مەسلەك و ئیستقبال و حەیاتی خۆیان ئەنێن بەلاوە، تێ هەڵئەچن بەهیچ ناگەرێنەوە کە توشیش بوون تەفرە دەرەکەیان باکی هیچی نیە، ئێمە خۆمان بە چاوی خۆمان دیمان بە گوێی خۆمان بیستمان کە لاوەکانمانیان هەڵ فریوان تەفرەیان دان، بەخەنجەر هەڵیان کوتایە سەر مەترالیوزی بەردەرکی سەرا خۆیان بەکوشت دا، ئەوان پێیان ئەگوتن دەبمرن !! ئەتان گوت بەکۆمەڵ ئەمرین غایەکەشیان ئەمە بوو رایان سپاردبوون عیراقمان ناوێ ئینگلیزمان ئەوێ، دیسان بە پیرەمێردیان ئەگوت تۆ خائینی لەگەڵ ئێمە نیت دەریان کرد رای کردە کەرکوك، دوایش هەر ئەو بۆیان گریاو شیوەنە مەشهورەکەی شەشی ئەیلولی بۆ کردن، بەوەش تەجروبەیان پەیدا نەکردەوە ئێستاش دیسان بەبێ غایە و بەبێ مەسلەحەت و تێبینی ئیشتراکی سیاسەت و موزاهرات ئەکەن و ئیستیقبالی خۆیانو خوێندنیان ئەنێن بەلاوە و لەناو خۆشیاندا ئەکەونە دووبەرکی و سەرو گوێلاکی یەکتری ))[1]، دیارە خوێندنەوەی ئەم بەشەی وتارەکەی دەشێ پیرەمێرد بخاتە ژێر پرسیارو گومانەوە، بەڵام کاتێ کە بەشەکانی تری وتارەکەی دەخوێنرێتەوە ئەوا هەر هیچ نەبێ گەلێ لەو پرسیارو گومانانە دەرەوێنەوەو ئەو راستییە دەردەکەوێ کە پیرەمێرد دژی تێکۆشان نەبووە لە پێناو ئازادی و سەربەستیدا، بەڵام تیروانینی وابوە کە تێکۆشان بۆ خۆی خۆ ئامادەکردن و کات و شوێنی لە بارو گونجاوی پێویستە، بۆیە دەڵێ:(( من هاواری ئەوەمە بخوێنن لێبنەوە وانەبێ کە لە مەکتەب و خوێندن بوون هیچتان بۆ نەکرێ، ئینجا کە خوێندەواری تەواو بوون ئەزانن وەزیفە و عەلاقەتان لە چ نەوعە مەسلەحەتی خۆتان و مەملەکەتاندایە، ئەو سایە ئازابن ئازادی بستێنن، بەڵام بەخوا ئازادی ئازایی و قابلیەتی پێ ئەوێ، ئینکار ناکرێ ئەم خاکە ئیستیعدادی زەکای بەرەنگێکە نەخوێندەوارە ئومیەکانی لە شاعیری وڵاتان زیرەکترە، گەدای لە شاجوانەمەرد ترە، ئەستێرەناسی لە خۆیانەوە لە زۆر ئیشی فەنی و میکانیکدا ماهیرن، هەرچی هەڵ ئەسێ وەستای ئوتومبیل و ماکینەو فابریقەیە، بەڵام نازانین زەکاو فیداکاری لە چیدا خەرج بکەین و تێهەڵچوو بێ غایەین و لە هەموو خراپتر پێکەوە ناخوسێین هەر کەسە خود پەسەندێکە ئەم لاو ئەولای خۆی ناروانێ ))[2]، کەواتە تێروانینی سیاسی پیرەمێرد لێرەدا ئەوەیە کە بەدەست هێنانی ئازادی خۆ

1ـ رۆژنامەی ژین، ژ (٩٣٤) ی ٩/ئەیلول/١٩٤٨.

2ـ سەرچاوەی پێشوو.



ئامادەکردنی دەوێ، زەمینەیەکی هۆشیاری و رۆشنبیری و یەکێتی و تەبایی پێویستە، پاشان دەکرێ ئازایانە ئازادی بە دەست بهێنرێ، هەر لێرەوە بەسەرپێی روانین بۆ ئەو تێروانینانەی پیرەمێرد لەو ساڵانە دا بووە هۆی ئەوەی کە هەندێ جاریش بەوە تاوانبار دەکرا کە کەسێکی عیراقچییە و بەو عیراقچێتیەش پشت لەمافە نەتەوایەتییەکانی گەلەکەی دەکات، ئەمە لە کاتێکدا کە خۆی راشکاوانە بیرو تیروانینەکانی لەم رووەوە خستۆتە روو و توویەتی:(( رۆژنامەکانی پایتەخت کەوتونە سەر و گوێلاکی یەك، ئیرشادی قەوم بە شیدەت و حیدەت ناکرێ، مەسئلە زۆر بەسیتە، دوو غایە لەناو دایە: یەکێ وەحدەتی عیراقییە، یەکێ وەحدەتی عەرەبییە، هەردووکیان بەرئاورد بکەین عەقڵ و مەنتیق و عیلم و تەجاروب کامیان پێش ئەخا، بە دەلیلی موقەنعە بەیەکتری بسەلمێنین، ئێمە ئەڵێین پەندی پێشینانە تا فەرز وەستابێ سونەت بەتاڵە، تا ماڵ پێی بوێ مزگەوت حەرامە.... ئەگەر حکومەتی عیراق تەنها لە عونسورێ تەشکیلی کردبێ لازمە لە بەغداوە تاحیجاز و یەمەن و میسر یەك بن، خۆ ئەگەر ئەساسی تەشکیلی حکومەتی عیراق کە عەباسین بە قوەتی خارجە و بەرەنجی ( أبامسلم ) و پشتیوانی خاڵوانی مەنسور تەقویە کرابێ و جامعەییکی عەناسریی خۆماڵی لە لاوە با شترن، شهد الله وحدەی عەرەبی باشە، بۆکێ، بۆ بەینی سوریا و فەلەستین، بۆ بەینی حیجاز و میسر و یەمەن، ئێستا لە بەغدا لەسەر کۆڵانێ راوەستن بزانن لەزەرفی نیو سەعاتا کێ دەبینن، تورك، فەیلی، لور، کەلۆر، جاف، داودە، تالەبانی، بارزانی.... هتد ئەمانە من لەژێر بەیداخی جامعەی عیراقییا بۆ حکومەت زۆر جار بەگژ برای خۆیاو سەیدی خۆیان چوون، تەیاری بەکام قوەت و قوماندار تەیرانی کرد لە ئیستیفتای تەبیعیدا قەومیەتو میللەت فیدای وەحدەتی عیراقی نەکرا؟))[1].

سەردەمانێکیش بەوە تاوانبار دەکرا کە پیاوی ئینگلیزە و بۆ بەرژەوەندی ئینگلیزەکان کاردەکات بۆیە لەوەڵامدا دەڵێ: (( ئەوانەی من بە تەرفداری ئینگلیز ئەزانن لەم دواییەدا تێم گەیشتن کە من ئینگلیزم بۆ خۆم خۆشناوێ و هەر چی مەنفەعەتی شەخسی و تەخسیسات و تەنانەت پارەی ئابوونەشم لەوان نەویستووە و ناشمەوێ، تەنها بۆ ئەمە کە لە رەوشت و ئەخلاقی ئەوان دەرسێکی ئیدارە وەرگرین و پەیرەوی ئاوایی ئەوان بکەین، هیچ نەبێ لەناو خۆمانا یەکێەتی و هاوبەشیەکی وامان هەبێ کە لە پیاو بچین ))[2]، تەنانەت کار گەیشتە ئەورادەیەی کە بەوە تاوانباری بکەن کە ئاگری نەورۆز بە پارەی ئینگلیزەکان دەکاتەوە هەر بۆیە لەوەڵامی

1ـ رۆژنامەی ژیان، ژ (٤٣١) ی ١٦ ی شوباتی ١٩٣٥.

2ـ رۆژنامەی ژین، ژ (١٠٠١) ی ٩/ئازار/١٩٥٠.

ئەمانیشدا وتوویەتی: (( هەندێك وتبویان حاجی توفیق نەورۆز بەپارەی ئینگلیز ئەکات و بۆ ئەوانی ئەکات، ئەمە لەکفری ئاتەش پەرستی کفرترە، ئینگلیز چە دەخلێکی بەنەورۆزەوە هەیە، یاخود من کەی لەخوانی موچەی ئینگلیز نیعمەت خۆر بووم..... تا پار هەندێ بێناموس و زۆڵ هەڵسان وتیان حاجی توفیق نەورۆز بۆ ئینگلیز ئەکا، ئێمە نایەڵێن ئەو بیکا خۆمان ئەیکەین، پارەیەکی زۆریان کۆکردەوە، نیوەیان خوارد و پەکی سەیرانی منیشیان خست )) [1]، گومانی تێدا نییە کە ئەم چەشنە تۆمەت بار کردنەی پیرەمێرد بەوەی کە بازنەی بەرژەوەندیەکانی ئینگلیزدا کاردەکات راستەوخۆ پەیوەندی بەو هەڵوێستەیەوە هەبووە کە دژی یەکێتی سۆڤیەتی جاران بووە، ئەم هەڵوێستەشی نەشاردۆتەوە بەڵکو راشکاوانە رای خۆی دەر بریوەو وتوویەتی:(( روس ئەیەوێ بە هەموو ئەو لکەی دنیادا فیتنە و خراپی بڵاوبکاتەوە لە عالەمدا نەیەڵێ لەقینی ئەوانەش سەلامەتی و ئاسایشی جیهانیان ئەوێ، مەسائیلی روس بەتایبەتی دوو روویەکە هیچ روویەك رووناکاتە ئەو روەکەی تری، روسی شیوعی دەوڵەتێکە و لە عینی زەماندا دەعوەتی ئیجتماعیشە لەبەر ئەوە ئەم دوو وەجهە یە لە هەندێ جیهاندا یەك ناکەون.... )) [2]، دیارە لێرەشدا دیسان ئەو راستییە لەبەردەم زۆر نووسەر و رۆشنبیرو سیاسەتمەدار دا یەکالا بۆوە کە ئەو هەڵوێستەی پیرەمێرد هەڵوێستێکی نەتەوەییانە بووە هەربۆیە ( د. مارف خەزنەدار ) لەم بارەیەوە دەڵێ: (( دژایەتی ئینگلیز و دۆستایەتی روس ئەگەر ئەو سەردەمە کارێکی باش بووبێ، لە دوایدا دەرکەوت باش نەبوو بەچاکە نەگەرایەوە، پیرەمێرد و خەڵکانی دیکەش ئەوانەی مەیلیان بۆ ئینگلیز هەبوو دژی کۆمونیزم و روسیا بوون، ئەم کارە لەنیشتمان پەروەری و کوردایەتی دووریان ناخاتەوە))[3].

هەر لێرەوە کاتێ ئاور لە هەڵوێستی پیرەمێرد دەربارەی رووداو و کێشە سیاسییەکانی ئەو سەردەمە دەدەینەوە ئەوراستییە دێتە بەردەست کە پیرەمێرد گەشتبوە ئەو بڕوایەی کە کێشەکانی گەلی کورد دەکرێ ئاشتیانە چارەسەر بکرێ هەر بۆیە ( د. مارف خەزنەدار ) یش راست دەکات کە

١ـ ئومید ئاشنا، پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی: ١/٢٥.

٢ـ پیرەمێرد، ئاوە رەشی روسی سوور، سلێمانی، چاپخانەی ژیان، ١٩٤٠، ل١ .

٣ـ د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، هەولێر، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٥، ل١٠٣ .



دەڵێ: (( سروشتی خەباتی پیرەمێرد ئاشتیانەبوو )) [1]، دیارە ئەگەر کاتی خۆشی ئەم هەڵوێستەی بە هەڵوێستێکی نادروست دانرابێ ئەوا ئەمرۆ تەنانەت بۆ ئەوانەش دەرکەوت کە هەڵوێستێکی کوردانەو پێشکەوتوخوازانە بووەو بەرژەوەندی نەتەوەکەی لەسەر و هەموو بەرژەوەندییەکانەوە داناوە بۆیە (عەبدوڵلا پەشێو) یش دەڵێ: ((پیرەمێرد قەت شاعیری دەسەڵات نەبووە، بەرژەوەندی باڵای نەتەوەکەی لەسەروی هەموو بەرژەوەندیەکی ترەوە داناوە، هەر بۆیە لەبەر ئەمەش پەیوەندی لەگەڵ شێخی نەمردا ئاڵۆز و گرێ دار بووە))[2].

## ٢ــ پیرەمێرد لەبواری کۆمەڵایەتیدا

کاتێ پیرەمێرد لەوڵاتێکی بزواو بەتیشکی شارستانیەت رووی کردەوە کوردستانێکی دواکەوتوو سڕبووی نەریتی ژەنگ گرتوی کۆمەڵایەتی، دەیزانی کە دەبێ یەکم ئەرکی ئەم هەڵتەکاندنەی بنەمای دواکەوتویی کۆمەڵگاکەی بێت و راماڵینی دیاردە دواکەوتۆکان بێت تا بتوانێ بە شارستانیەتی نوێ و بەژیانی نوێ و خۆشگوزەرانی ئاشنایان بکات، هەر بۆیە( عەبدڵلا پەشێو ) دەڵێت: (( کەم نین ئەوانەی باسی هەژاری و دادی کۆمەڵایەتی دەکەن، بەڵام هەر ( تۆلستۆی ) توانی دەست لە خۆشی ژیانی مادی و هەموو ئارەزووەکانی خۆی هەڵگرێ و دوای ئەو ئیدیاڵانە بکەوێ کە ئیدیعای دەکردن، خۆشبەختانە لە ئەدەبی کوردیدا ئێمەش پیرەمێردمان هەیە، کەڵکەڵەی دەست هەڵگرتن لە خۆشگوزەرانی هەر لە زووەوە لای پیرەمێرد چەکەرەی کردبوو )) [3].

بەگشتی چالاکییە جۆربەجۆرەکانی پیرەمێرد لەلایەك و وتارە کۆمەڵایەتییەکانی لە لایەکی ترەوە گەواهی ئەو راستیەن کە خەم خۆرانە دەیویست بەرگی نوێخوازی بەگشت بوارە کۆمەڵایەتییەکان بپۆشێ و سیمای دواکەوتوییان لێ داماڵێنێ کە دیارە بواری رۆشنبیری و خوێندەواری یەکێ بووە لەو بوارانەو قوتابخانەی زانستیش جێگەی شانازی بووە بۆی کرد بە مەڵبەندێکی خوێندەواری و رۆشنبیری هاوچەرخ بۆ گەلەکەی و هەروەك ( د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ ) دەڵێ: (( زانستیی کردبوو بە

١ـ د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی: ٥/١٠٠ .

٢ـ عەبدوڵلا پەشێو، بیری نەتەوەیی لەشیعری پیرەمێردا، گۆڤاری باسکار، ژ (٦) ی ساڵی ٢٠٠١، ل٤٣ .

٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ل٣٧

مەڵبەندی گەورە بەخوێندەوارکردن، ئەیشیزانی کە خوێندەواری هەر خوێندن و نووسین نییە بەڵکو هوشیاری کۆمەڵایەتی و سیاسی و شارستانێتیشە ))[1].

یەکێك لە تێڕوانینی نوێخوازیانەی پیرەمێرد لەم بوارەدا بایەخدانی بوو بەوشیار کردنەوەی ژنان لەرێگای خوێندەوارکردنیانەوە کە بێگومان بۆ ئەو سەردەمە مەگەر تەنها کەسێکی وەك پیرەمێرد توانیبێتی ئەو کۆسپ و ئاستە نگانە بشکێنێ کە ڕێگر بوون لەبەردەم خوێندەوارکردنی ژناندا، ئەوەتا خۆی لەم بارەیەوە دەڵێ: ((مەکتەبی کچان لە سلێمانی کرایەوە لەپێشدا ویقواواژیان کرد، کچانی خۆیان نەنارد، تا ئێمە دەستەی کچانی خۆمان نارد ئەوانیش ناچارمان، بەرە بەرە کچانی مەکتەب پەرەیان سەند، بەهیمەت و جەسارەتی مودیرەی مەکتەب کچانمان برد بۆ ساحەی موسابەقەی (فوتبۆڵ) هەموو بەرگی سپی لاهوتی و مەلەکوتیەوە بەدەوری ساحەدا چەرخێکیان داو نەشیدێکیان خوێندەوە، زەمین و ئاسمان هاتنە جونبوش، ئەو سەفوەت و لەتافەتە و ئەو سەربەستی و حەماسەتە بە دڵێکی پاك کوڕوکچی کرد بەبرا))[2].

بێگومان بەشێك لەو کۆسپ و ئاستەنگانەی کە دەهێنرانە سەر ڕێی ژنان و مافەکانیان پێ زەوت دەکرا بەناوی ئایین و لە ژێر پەردەی ئاییندا کاری بۆ دەکرا هەروەك چۆن بەهەمان بانگەشەی ناراستی ئایینەوە دیاردەی دزێو پەردە پۆش دەکرا و دیاردە چاکەکانیش لەکار دەخران، هەر بۆیە پیرەمێردیش زیرەکانە هەوڵی ئەوەی داوە تیروانینی ڕاستی ئایینی لە کۆمەڵگاکەی بگەیەنێ و ئەوەیان بۆ ڕوون بکاتەوە کە ئایین نەك هەر بەربەستی شارستانیەت نییە بەڵکو دەکرێ بکرێتە رەنگ ڕێژ کەری شارستانیەتیش کاتێ کە ڕاستگۆیانە مامەڵە لەگەڵ ئاییندا کرا بۆیە دەڵێ: (( پێغەمبەر (ص) کەعبەی لەبت پاك کردەوە، تۆیش دڵی خۆت لە بەندە پەرستی پاکەوە، کەبەندە پەرست نەبوویت خوا پەرست بووی جەزبەیەکی خۆشەویستی خوات دێتە دڵەوە، بەسەرمەستی ئەڵێ ی ئایەی بەهەشتم ناوێ لیقای تۆ خۆشە، ئەگەر وات لێهات گەیشتیتە خواو دڵی خۆت بەست بەخوداوە ئیترکارت تەواوە ئیحتیاجیت بەنوێژو ڕۆژو نەماوە، نوێژ بۆ ئەوەیە ڕۆژی پێنج جار بچیتە حزوری پەروەردگار، تۆکە دایم لە حزوری دایی، بەسەر نانە سەرخاك بەدڵی ناپاك، چەکار بە دڵی خاڵی سەربەخاکا بماڵی مەگەر لەنوێژدا حیسابی ماڵ وپارە ڕێك خەی، حەج سیاحەتی جیهانە و بۆسوێندی درۆکە بڵێ (بەوکابەیە کە

---

١ـ د. عیزەدین مستەفا رەسول، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، هەولێر، چاپخانەی فێرکردنی باڵا، ١٩٨٩، ل٧١

٢ـ ئومێد ئاشنا، پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی: ١/٢٧



دەستم بە قوڵی گرتووە) سەبەب باوەر و ئیتمیئنانە، دەستی هەژار گرتن کاری مەردانە، جارێ ئەمجارە دەنەسیحەتان بۆ ئەنووسین: ١ــ لەپێش هەموو شتێکا ڕاست گۆ و ڕاستە ڕەوبە. ٢ــ بەئینساف بە. ٣ــ دۆستی عالەم و دوژمنی نەفس بە. ٤ــ پیاوی پیاو مەشکێنە. ٥ ــ لەگەڵ ورداندا بە شەفەقەت بەو بۆ ولی الامر بەتاعەت. ٦ــ لەگەڵ هەژاران و داماوان بە سەخاوەت. ٧ــ لەگەڵ دۆستاندا بەنەسیحەت و مروەت. ٨ــ لەگەڵ دوژمندا بە مداراو کزشت. ٩ــ لەگەڵ جاهیل و نەفام بێ دەنگی و خامۆشی، ١٠ــ سێ شتی ترنیشانەی نەگبە تییە، ناشکوری، بێ سەبری، چاو برسێتی ))[1].

تێڕوانینێکی تری پیرەمێرد لەم بوارەدا گرنگی دانی بووە بەبواری تەندروستی، ئەوەتا لەرێگەی ئامۆژگارییە تەندروستیەکانەوە و بەمەبەستی خۆپاراستن لەزیانی جگەرەکێشان لەوتارێکی دا بەناوی (خراپەی تووتن) باسی زیانی جگەرە دەکات و ڕێنمایی خەڵکی دەکات بۆلێ دوورکەوتنەوەی چونکە سەرچاوەی کۆمەڵێ کێشەی تەندروستییە بۆ مرۆڤ و دەڵێ: ((ئێستا ئەم خەڵکە کە ئەڵێن جگەرەکێشان زیانی زۆرە و ئەیشی کێشن، ئەگەر هۆشیان ببێ نایکێشن، زۆر مەرد دەبینم کەو تویانە نایکێشین ڕاستیان کردووە ئیتر نەیان کێشاوە دەساڵ عومریان بۆ گەڕاوەتەوە))[2].

بەم پێیەو بەم تیروانینانەی کارامانە هەوڵی دەدا بیری نوێخوازیانە و ڕەفتاری هەڵسوکەوتی نوێخوازیانە لە ناو کوردەواری دا تۆو بکات تا بە چەکەرە کردنیان کوردیش بگاتە ئاستی کۆمەڵگا پێشکەوتۆکانی جیهان.

## ٣ــ پیرەمێرد لە بواری ڕۆشنبیریدا

پیرەمێرد خۆی دەربارەی ئەو ڕۆژگارەی کە هاتەوە ناو باوەشی کوردستان دەڵێ: ((کە گەیمەوە ئێرە لەرێوە خزمەتی خوێندەواری و ڕۆژنامەگەریم لە هەموو خزمەتێ بە پێشتر زانی لە هەموو عەلایق و خولیایەکم وازم هانی ))[3]، بەم پێیەو بە دەرك کردن بەو ڕاستیەی کە ڕۆژنامەگەری دەتوانێ زەمینەی لەبار بۆ هەموو ئەو گۆرانکاریانە برە خسێنێت کە پیرەمێرد مەبەستی بوو بەدیان بهێنێت بەو پێیەی تاقیکردنەوەیەکی چاکی لەوبوارەدا لە ئەستەموڵ هەبووە، دیارە ڕۆژنامەگەریش وەك فاکتەرێکی

---

١ـ ڕۆژنامەی ژین، ژ (٦٨٤) ی ١/ تشرینی یەکەمی /١٩٤٢

٢ـ ڕۆژنامەی ژین، ژ (٦٢٠) ی ٦ / مارت / ١٩٤١

٣ـ ڕۆژنامەی ژین، ژ (٩٤٨) ی ٣٠ / کانوونی دووەمی / ١٩٤٨

گرنگی بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری نوێخوازانە ئەو بوارەی بۆ پیرەمێرد کردەوە کە راستەوخۆ کار بۆ چاندن و گەشەپێکردنی رۆشنبیریەکی نوێی هاوچەرخانە بکات، ئەمە سەرباری ئەوەی کە هەر لە رێگای رۆژنامەگەرییەوە توانیویەتی پێوەندی لەگەڵ رۆشنبیرانی سەردەمەکەیدا ببەستی.

دیارە رۆژنامەی (ژیان) و (ژین) بۆ خۆیان گەواهی ئەو راستییەن بەو پێیەی پیرەمێرد وریایانە و زیرەکانە کردبونیە قوتابخانەیەکی رۆشنبیری نوێخواز بۆ سەردەمەکەی و لەو قوتابخانەیەدا سەدان رۆشنبیر پەروەردە بوون، تەنانەت رۆژنامە و گۆڤارەکانی دوای ژیان و ژین گەلێ سوودیان لەو رەوتە رۆشنبیرییەی پیرەمێرد وەرگرتووە کە کردبویە شەقڵی دیاری ژیان و ژین.

هەر بەوگیانی رۆشنبیری نوێخوازیەوە بووبوە رابەرو هاندەری گەلێ لەرۆشنبیران و ئەدەبیان و نووسەرانی سەردەمەکەی ئەوەتا دەربارەی ( ئیبراهیم ئەحمەد ) دەڵێ: (( لە خوێندەوارە هەڵبژێردراوەکانمان( ئیبراهیم ئەحمەد ) کۆلێجی حقوقی تەواو کردووە و سەودای وەزیفەی نەکەوتۆتە کەللەوە هاتووە ئەوقاتی ئەکا، ئەو کورە ئێمە دەیناسین لە هەرچی زمان هەیە شێوەیەکی پەسەندی بۆ خۆی داناوە..... جەزبەیەکی شاعیری هەیە، ئەتوانێ دەعوا لە پەردەیەکی جواندا تەسویر بکاو بیباتە زهینی گوێگرانەوە، خوا وێنەیان زیادکات )) [1].

دیارە هەر زووش بۆ ( گۆران ) ی شاعیر بوە رابەرێکی دڵسۆز بۆیە گۆران دەربارەی دەڵێ: ((ماوەتەوە سەر ئەوە کە قوتابییەکانی تۆ بەپەسەندکەری بێ ئەندازە و جێگیری کەم تا زۆرتەوە، پیاوانە تێکۆشین جێگا چۆڵەکەت پرکەینەوە لەو جێگایەوە ناتەواو بەجێت هێشتووە دەست بکەین بە دروست کردن و داهێنانی تازە)) [2].

یەکێ لەخەمە گەورەکانی پیرەمێرد لەو کاتەدا خەمی نەبوونی زمانێکی یەکگرتووی کوردی بووە کە وەك رۆشنبیرێك هەوڵی بەدیهێنانی بۆ داوە ئەوەتا دەڵێ: (( لە ئەستەمول غەزەتەی کوردی دەردەچوو، من لە (جولەمێرگ ) وە مەقالەیەکم بۆ ناردبوون تەکلیفم لەجەمعیەتی کورد کردبوو کە لە هەر دیارێکی کوردستانەوە زبانزانێك بانگ بکەنە پایتەخت و زمانێك بۆ عمومی کورد هەڵبژێرن و بیکەن بە فەرهەنگ و دەستور هەتا مەساریفی لە چاپدانیشم گرتبوە ئەستۆی خۆم، کەس گوێی

١ـ رۆژنامەی ژیان، ژ (٥٣٨) ی ١٠ / ئاب / ١٩٣٧

٢ـ گۆران، نوسین و پەخشان و وەرگێراوەکانی، ئامادەکردنی ئومید ئاشنا، هەولێر، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٢، ل٢٦



نەدایە، ئێستا هەر کەسە بەهەوەسی خۆی شێوەیەك دێنێتە کارەوە وایان شێواندووە........ ئەو هەموو موحیتی کوردستانە کەمن باوەرم وایە تا زبانیان یەك نەکەوێ یەك ناگرن )) [1]. هەر لە پاڵ گرنگی دانی بەزمانی کوردی بەو مەبەستەی ببێتە زمانێك لەدنیای شارستانیەتدا و بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستەش پێویستە گەنجانیش رۆڵی خۆیان لەوبوارەدا ببینن، ئەوەتا لە گۆڤاری (ژین) ی ئەستەموولی ساڵی ١٩١٨ دا وتارێکی بەزمانی تورکی بەناوی ( زمانی کوردیمان ) بڵاوکردۆتەوە و تیایدا دەڵێ: (( پێویستە وتووێژێکی کراوە لەسەر زمانی کوردی ئاواڵە بکرێ، نەك تەنها لەنێوان پیران وپیاو ماقوڵانی کوردا، بەڵکو دەبێ گەنجانیش بەشداری لەم دانوسان و گت و بێژانەدا بکەن و دەبێ زمانی کوردی پەرەی پێ بدرێ و وەلانەخرێ و لەجیهانی شارستانیدا بەکار بهێنرێ )) [2].

لەپاڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوەشی لەیاد نەچووە لە بوارەکانی تری رۆشنبیری نەتەوەییدا بەتایبەتی لە بوارەکانی جوگرافیاو مێژوو شێوازی کارگێری و یاسا و ئابووریدا وتاری جۆراوجۆر بڵاوکاتەوە تا بەهۆیانەوە رێگا بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندنی رۆشنبیرانی هاوچەرخ بکاتەوە. [3].

١ـ رۆژنامەی ژین، ژ (٦٧٩) ی ١٣/ئابی/١٩٤٢

٢ـ اسماعیل وداد، کرد جەلسانمز، گۆڤاری ژین (ئەستەمول ) ژ ٩ ی (١٦) ی / کانوونی دووەمی / ١٣٣٥ ی رۆمی، ل٢٩.( ئەم وتارە لەلایەن ( د. جەبار قادر ) ەوە کراوە بە کوردی ). بروانە: د. جەبار قادر، لەبارەی دەقە تورکیەکانی پیرەمێرد، گۆڤاری باسکار، لەندەن، ژ (٦) ی ساڵی ٢٠٠١، ل٨٤.

٣ـ لەرۆژنامەی (ژیان) ی ژ (٤٢٣) ی ٢٢/کانوونی دووەمی/١٩٣٤ دا وتارێکی مێژوویی بەناوی (قەزای هەڵەبجە) بڵاوکردۆتەوە. هەروەها لەرۆژنامەی (ژیان) ی ژ (٤٢٧) ی ١٩/کانوونی دووەم/١٩٣٥ دا وتارێکی ئابووری بەناوی (کورد کۆشی) بڵاوکردۆتەوە. هەروەها لەرۆژنامەی (ژیان) ی ژ (٤٣٠) ی ٩/شوبات/١٩٣٥ دا وتارێکی مێژوویی بەناوی (باسی بەردە نووسراوەکەی ماوەت ) بڵاوکردۆتەوە. هەروەها لە رۆژنامەی (ژیان) ی ژ (٥٣٥) ی ١٩/تەمووز/١٩٣٧ دا وتارێکی ئابووری بەناوی (شارەزوور ئاوابێ ) بڵاوکردۆتەوە. هەروەها لە رۆژنامەی (ژین) ی ژ (٦٨٦) ی ٢٢/تشرینی یەکەمی/١٩٤٢ دا وتارێکی دەربارەی (حقوق و ئیدارە ) بەناوی (عیلمی حقوق) بڵاوکردۆتەوە.

## ج ــ دەنگی نوێخوازیانەی پیرەمێرد لەبواری ئەدەبیدا

سەرەتا بەو راستییە دەچینە ناو ئەم باسەوە کە (گۆران) ی شاعیر لەتیروانینێکیدا دەربارەی پیرەمێرد خستوویەتیە بەردەست و وتویەتی (( چارەکە چەرخێك لەمەوبەر، تۆ ئاگری جگەری نیشتمان دەستی لە دووپارچە جگەری خۆت پێ هەڵگرتی لە ئەستەمولّ خۆت گەیاندەوە گوێ ئاگکردانەکۆنەکەی کە سەردەمێك قەڵەندەرخانەت ناو نابوو، ئەوحەلە ئەو لاوانە هێشتا لەدایك نەبوو بوون، لەبەر ئەوە ئاگایان لێ نییە کە زمان و شیعر ئەدەبی کوردی کەساوایەکی پێ رەوکە بوو هێشتا لەشۆرشگێر زیاتر پێویستی بەپیرێکی دڵسۆزی هێمن هەبوو وەکو (لەلە) لەگەڵ پێگەیاندنی خەریك بێت، لەوکەسانەی بۆ ئەم خزمەتە هاتنە مەیدان درێژەی بەرگە گری و مایەی نووسینی بەجێ ماوت گەوایی ئەدەن کەتۆ لەهەموویان زاڵ تربوویت )) [1]، دیارە هەر ئەم راستییە رێگای ئەوەمان بۆ خۆش دەکات کە کۆمەڵێ راستی تر لە ژیانی ئەدەبی پیرەمێرد هەڵێنجێنین کە بۆ خۆیان زانستانە شوێن و پێگەی لەبزوتنەوەی نوێخوازی شیعری کوردیدا دیاری دەکات.

دیارە سەرەتا کە پیرەمێرد گەیشتەوە کوردستان رێچکەی یەکەمی شیعری نوێی کوردی کە (شێخ نووری شێخ سالّح ) رابەرایەتی کردووە چەندسالێك بوو کرابۆوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین پیرەمێرد کەم و زۆر رووی لەو رێچکەیە نەکردووە هۆی ئەمەش بەلای ئێمەوە ئەوە بووە کە ژیانی ئەستەمولّی لەلایەك و تێکەڵاو بوونی لەگەڵ ئەو شاعیرە تورکانەی کە شێخ نووری و هاورێکانی پێیان گاریگەر بوون، ئەورێچکەیەی شێخ نووری رێچکەیەکی نوێ نەبووە بۆی چونکە پێشتر بەو رێچکە شیعرییەدا تێپەریبوو، جا وەك شاعیر بووبێ یا وەك چێژ لێ وەرگر، ئەوەتا خۆی دەڵێ: (( لەم دواییەدا لە ئەستەمولّ دەورەی ئەدەبیاتی تورکی کە شاعیری وەك ( عبدالحق حامد، توفیق فکرەت، فائق عالی، ئیسماعیل سەفا، ئەکرەم، سلێمان نەزیف، خالید چیا و ئیسماعیل حەقی بابان، نەعیم بەگ، حوسێن جاهد ) و هەزاران ئەدیبکی کە ( سەروەتی فنون ) یان لە ئەدەبیاتدا کردبووە خاوەن سەروەت و رۆحێکیان پێ دا بوو منیش لە دوایانەوە گوڵەچن بووم )) [2]، ئەمە سەرباری ئەوەی کە پیرەمێرد هەر لەسەرەتاوە دەویست شیعری کوردی بەرەو رەسەنایەتی بەرێت نەك بەرەو لاسایی کردنەوەی ئەدەبی میللەتانی تر کە بێ گومان یەکەم هەنگاویشی لەم بوارە دا بە گۆرینی زمانی شیعر دەستی پێ کرد

١ـ یادی پیرەمێرد، لەژێر چاودێری عەلادین سجادی، بەغدا، چاپخانەی مەعاریف، ١٩٥١، ل٧٦

٢ـ ئومێد ئاشنا، پیرەمێرد و پیداچوونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی: ١/٢٠



تانەك هەر لە وشەی عەرەبی و فارسی دایالێنێ کە بووە بوونە سیمای شیعری کلاسیکی کوردی، بەڵکو لەو وشە تورکیانەش پاکاتەوە کە لە رێگای رێچکە شیعرییەکەی (شێخ نوری ) یەوە هاتبوونە ناوەوە.

بەم پێیە پیرەمێرد بە یەکەم رەنگ رێژکەری زمانی شیعری کوردی رەسەن دادەنێین ئەو زمانەی کە بووە سیمایەکی دیاری دووەم رێچکەی نوێگەری شیعری کوردی کە لەسییەکان بە دواوە (گۆران) جڵەوی رابەرایەتی گرتە دەست، (گۆران) خۆی دەربارەی ئەم راستیە دەڵێ: (( ئەگەر بەراوردێك بکەین لە بەینی شیعرەکانی ئەوو هی قوتابخانەکەی ئێمە، ئەبینین شیعری ئەو (قەومی ) تربوو، سنعاتی کوردی و هەستی کوردی زیاتر پیشان ئەدا. بەڵام ( کوردی پەتی ) لە نووسینەکانی ئەوا کە لە بێژنگ بدرێ، لەشیعردا بەقەدەر من و لە پەخشاندا بەقەدەر شاکر فەتاح و ئیبراهیم ئەحمەد نییە......... تەئسیرەکەشی لەلایەن ئیحساساتی نەتەوایەتییەوە بوو نەك لەلایەن هونەرەوە، کە خەڵکی هان ئەدا کوردی پەتی بنووسن )) [1]، ئەگەرچی ئەم تێروانینەی (گۆران) بۆ پیرەمێرد لێرەدا گەلێ جیاوازە لەو تێروانینەی کە لە وتارێکی دا بە بۆنەی چلەی کۆچی پیرەمێردەوە نووسیویەتی [2] و لەهەموو روویەکەوە پیرەمێرد بەرابەر دەزانێ بەڵام دەکرێ لەم تێروانینەی دواتریدا کە بە چاوێکی جیاوازتر لە پیرەمێرد دەروانێ هەندێ راستی گەڵاڵە بکرێن: پێش هەموو شتێ بەراورد کردنی پیرەمێرد بەگۆران خۆی و بە شاکر فەتاح و ئیبراهیم ئەحمەد لەبواری کوردی پەتی نووسیندا کە ئەمان لە پیرەمێرد زیاتر وشەی کوردی پەتیان بەکارهێناوە کاتێك راستە کە بەرهەمی دوای کۆچی دوایی پیرەمێرد و تا ساڵی (١٩٦٢) بخەنە ئەو بواری بەراوردەوە، ئەگینا تا ساڵی (١٩٥٠) واتە ساڵی کۆچکردنی پیرەمێرد هەرگیز ئەو بۆچوونەی گۆران بەراست نازانرێ، راستییەکی تر ئەوەیەکە کاریگەری ئەو رووکردنە کورد بە پەتییە لەلایەن پیرەمێردەوە گۆران خۆشی گرتەوەو هەر بەو کاریگەرییەش توانی رێچکەی نوێگەرییەکەی شیعری کوردی بکاتەوە بەو پێیەی لە ساڵانی سەرەتای تەمەنە شیعرییەکەی گۆراندا پیرەمێرد و قەڵەندەرخانەکەی بونە ئەو مەڵبەندە شیعرییە رەسەنەی کە گۆرانیان بەرەو نوێگەرییەکە برد.

دەربارەی ئەم رۆڵە گرنگەی پیرەمێرد لە ژیانی ئەدەبی گۆراندا بەگشتی و لەبواری بەرەو نوێگەری چوونی گۆران لە شیعری کوردیدا ( د. دلشاد عەلی ) دەڵێ: (( دەوڵەمەندی تەمەنە شیعرییەکەی (گۆران) ئاکامی خواستێکی دەروونی وروژێنراوی کێشەی (من) ی گۆران بووە لەگەڵ (ئەوان ) ی

١ـ عبدالرزاق بیمار، دانیشتنێك لەگەڵ گۆراندا، گۆڤاری بەیان، ژ (٢) ی شوباتی ١٩٧٠، ل٣٠

٢ـ گۆران نووسین و پەخشان و وەرگێراوەکانی: ل٨١

دەوروو بەریدا، (من) یێك کەوەك هەر بلیمەت و داهێنەرێك، بەردەوام هەوڵی پێکهێنانی (ئێمە) یەکی سایکولوژی داوە تا بگونجێ لەگەڵیاندا و ئارام بێت لە ناویاندا، بە تایبەتی (ئێمە) یەك لە چێژ لێ وەرگر و پەسەندکەری شیعرەکانی. فاکتەرەکانی رووبەرووکردنەوەی (گۆران) یش لەگەڵ ئەوکێشەیەدا، لەدووسەرچاوەوە رایەڵە کراون کە بوارە کۆمەڵایەتیەکە و بوارە ئەدەبییەکە بوون، یەکەمیان ناوەوەی (من)ی (گۆران) ی پێ دەوڵەمەندکراو دووەمیشیان رێچکەی شیعری نوێی پێ کردەوە، هەر لەسەرتا شەوە شوێن دەستی (پیرەمێرد) لە هەردوو بوارەکەدا راشکاوانە دەبینرێ، لەبواری یەکەمدا بڕوا بە خۆبوون و گەشبینی و لەبواری دووەمیشدا هەوێنی رەسەنایەتی خستە بەردەست (گۆران)، ئەگەرچی ئەم ڕۆڵە گرنگەی (پیرەمێرد) یش لەسەری لەلایەن (گۆران) خۆیەوەو لەلایەن زووربەی نووسەرانەوە شارراوەتەوە )) [١].

دیارە هەر لەپاڵ ئەو رووکردنە زمانە کوردی پەتییە بوار بۆ ئەوەش کراوەتەوە لەبەردەم پیرەمێرد دا کەوێنەی شیعری نوێ بنیات بنێ، وێنەیەك کە زیاتر ئاشنان بە ئەندێشەو بە چێژی شیعر دۆستی ئەو قۆناغەی ئەدەبی کوردییەوە، بەتایبەتی ئەو وێنانەی کە ئەندێشەی پیرەمێرد لە سروشتی جوانی کوردستان خۆیەوە وەری دەگرتن، بۆیە بەلای ئێمەوە لەم بوارەشدا پیرەمێرد بەداهێنەر و دەنگێکی نوێگەری شیعری دادەنرێ، دەتوانین ئەم راستیانەش لەبەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەدا بخەینە بەردەست هەر وەك چۆن لەبەشی سێیەمدا ئەوراستیانە دەخرێتە بەردەست کە لە رووکردنە هەندێ بابەتی شیعریدا دەست پێش خەرو نوێکەرەوە بووە.

---

١ـ د. دلشاد عەلی، گۆران داهێنان و نوێخوازی ــ لێکۆڵینەوەیەکی سایکولۆژی، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، ژ (٢٠) ی حوزەیرانی٢٠٠٧، ل٥٩

## ١ــ زمان لەدەقە شیعریەکانی پیرەمێرد دا

گومانی تێدا نییە کە بنەمای سەرەکی لە سازدانی چەمکی شیعردا لەهەر سەردەم و قۆناغێکی رۆشنبیری میللەتاندا بووبێ زمان بووە، تەنانەت زمانی شیعر بۆ خۆی بووە بە سیمای جیا کەرەوەی دەقی شیعری لە جۆرەکانی تری دەقی نا شیعری [1]، بەم پێیە دەنگی تایبەتمەندی شیعری هەرشاعیرێك زمانەکەی پێی دەبەخشێ [2]، بۆیە کە باس لە تاقیکردنەوەی شیعری هەر شاعیرێك بکەین ناکرێ زمان دوورخرێتەوە.

هەر لێرەوە کاتێ روو لەزمانی دەقە شیعریەکانی پیرەمێرد دەکەین لەروانگەی ئەو راستییەوە ئاوری لێ دەدەینەوە کە کاتێ پیرەمێرد هاتە ناو جیهانی شیعری کوردییەوە نەك هەر شوێن پێی شاعیرانی پێش خۆی و سەر دەمەکەی خۆی هەڵنەگرت بەڵکو راستەوخۆ و لەیەکەم هەنگاونانیدا رووی لەگۆرینی زمانی شیعری کوردی کرد کە لە بازنەی دوو شێوازدا دەسورانەوە، شێوازە کلاسیکیەکەو شێوازی رێچکەکەی ( شێخ نوری) و هاورێکانی لە بیستەکاندا کە (گۆران) بە لاسایی ئەدەبی عوسمانی ناوی دەبات، دیارە ئەو گۆرینەش بەرووکردنە وشەی کوردی پەتی بووە بەو رادەیەی کە بووە رێچکەشکێن و رەنگ رێژکەری شیعری نوێی کوردی [3]، هەر بۆیە ( معروف بەرزنجی ) دەربارەی کوردی پەتی نووسین لە ئەدەبی کوردیدا بەگشتی و لە شیعری کوردیدا بەتایبەتی دەڵێ: (( پێشەوای ئەم نووسینەش پیرەمێردە لە شێوەی کرمانجیدا، وە مامۆستا گۆران شاگردی ئەوە وە هونەری ئەم

---

١ـ بروانە: د. أحمد محمد المعتوق، اللغة العليا ــ دراسات نقدية فی لغة الشعر، بیروت، المركز الثقافی العربی، ٢٠٠٦، ص٢٨. هەروەها بروانە: د. ابراهيم السامرائی، لغة الشعر بين جيلين، بيروت، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، ١٩٨٠، ص٢١. هەروەها بروانە: عمران خضير حميد الكبيسی، لغة الشعر العراقی المعاصر، كويت، و كالة المطبوعات، ص١١.

٢ـ بروانە: ئەکرەم قەرداغی، زمان لەشیعری نوێدا، گۆڤاری ئایندە، ژ(٦٥) ی ساڵی ٢٠٠٦، ل٥٤ــ٥٥

٣ـ بروانە: د. پەرێز سابیر، رەخنەی ئەدەبی کوردی و مەسەلەکانی نوێکردنەوەی شیعر، هەولێر، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٦، ل٣١١



ئەوەیە کە توانی زوو وەباش خۆی لەبابەتی کۆنەوە بگۆرێتە سەر بابەتی تازە، وە هەوڵیدا بەکوردی پەتی رەوان بنووسێ و لەسەر شوێن پێی پیرەمێرد بڕواو پێشکەوێ ))[1].

وەك دەردەکەوێ ئەو رێچکە نوێیە نەك هەر شاعیرانی تری بەرەو خۆی راکێشا بەڵکو کۆمەڵێ نووسەر و رۆشنبیری تریش روویان تێکرد، ئەوەتا ( ئیبراهیم ئەحمەد ) لەسەرەتای چوونە ناو جیهانی ئەدەبەوە روو لە پیرەمێرد دەکات و دەڵێ: (( گەورەی خۆم نووسیندەی ژیان.... کەبیستم چاکی زبانتان گرتووە ویستم یارمەتیدان بدەم، ئەوەی لەدەستم دێت نووسینی هەندێ مەقالەی ئەدەبییە بە کوردی پەتی...... ئەمەم لەدەست دێت بەڵام شەرت ئەوەیە کە یارمەتیەکەم قبول بکەن...... وا دیارە کە هەر وەکو خۆتان بە پیری دەستتان داوەتە چاکی زبان ناتانەوێ بەگەنجی هاوولاتتان دەستی لێ بەربدەن )) [2] , وەك دەریش دەکەوێ هەر ئەو کوردییە رەوانەی کە ( ئیبراهیم ئەحمەد ) یش وتاری( شاعیرەکانمان ) ی پێ نووسیەوەو بۆتە هۆی ئەوەی کە پیرەمێرد وتارەکەی بەرادەیەك پەسەندکا کە پێی بڵێ شیعرێکی پەخشانە و دەربارەی دەڵێ: (( ئەو کورە راست ئەکا ئێستا ئەوەیە چۆن هاتە پێش چاوت و چۆنت دی ئەوە بەشێوەی رەوانی و بەزمانی خۆت بیهۆنیتەوە، ئەوکورە جارێ شێوەی نووسینەکەی لای من ئەوەندە رەوانە شیعرێکی پەخشانە )) [3].

لەگەڵ ئەوەی هەرکاتێ باس لەسەرەتای روو لە کوردی پەتی نووسینی پیرەمێرد کرابێ راستەوخۆ روو لە دەقی ( من و ئەستێرەکان ) ی ساڵی (١٩٢٦) ی کراوە، بەڵام دیارە پیرەمێرد پێش ئەو دەقەی سیمای کوردانەی داوە بە دەقە بڵاو کراوەکانی تریشی بەرادەیەك کە نەتوانرێ نەبخرێتە ریزی دەقە کلاسیکیەکان و نە دەقەکانی سەر بە رێچکەکەی (شێخ نوری ) و هاورێکانی، راستە لەو دەقانەدا تاکە تاك وشەی عەرەبی بەکار هاتوون بەڵام سیما و شەقڵی بنیاتەکانیان کوردیەکی پاراون، هەروەك لەم دەقانەیدا دەبینرێ: لە دەقی ( لەسەر بەردێك ) ساڵی (١٩٠٨) کەیدا دەڵێ:

**لەسەر بەردێك هەڵۆیی هەڵفری کەوتە هەوا بێغەم**
**هەوای سەید و شکاری کەوتە سەر: تاکەوتە سەر عالەم**
**هوایەکی غروری کەوتە سەر، خۆی زۆر لە بەرز زانی**

---

١ـ مەعروف بەرزنجی، کامەرا ن و دیارییەکەی، گۆڤاری شەفەق، ژ (١) ی ١٥ کانوونی دووەمی ١٩٨٥، ل١٥

٢ـ رۆژنامەی ژیان، ژ(٣٢٦) ی ٦/١٦ / ١٩٣٢

٣ـ تەنقیدێکی ئەدەبی لە بابەت دەرچوونی یادگاری لاوانەوە، رۆژنامەی ژیان، ژ (٣٧٦) ی ٧/ئەیلول / ١٩٣٣.

**پەڕی گیف کرد و باڵی لێك ئەدا هەتاكو دەیتوانی** [١]

لە دەقی ( لەگوێم دێ دەنگی لایلایەی وەتەن ) ی ساڵی (١٩٢٥) دا دەڵێ:

**لەگوێم دێ دەنگی لایلایەی وەتەن دایك جگەر سووتاو**
**دەڕێژن بەسەر وێرانەكەی خوێناویا خوێناو**
**ئەلاوێنێتەوە ئەگری سەری شینە لە ماتەمدا**
**شەو ڕۆژ كۆتەڵی منداڵەكانی والەبەر دەمدا**

**قەسەم بەو عەزمی كوردەی شانی (ریچارد ) ی بەشیر ڕوشان**
**كڵاوی كورد ئەبێ قوچ بێ كە هاتوشانی خۆی جولاّن**
**شەوێك پیاوێك لەبەفراما، نەمرد ئاگرێكی دووری دی**
**لەلای من نا ئومێدی كوفرە، ئەم ئاگرەی دڵم بۆكێ** [٢]

هەرچی دەقی ( كچە كوردی پۆشتەو پەتی ) یان ( من و ئەستێرەكان ) نیشێنی ئەوا خـۆی لەپێـشەكێكەیدا دەڵێ: (( ئەم كچە كوردەیەم، كە بەم جلە كوردیە پەتیە پۆشتە كردۆتەوە تینۆڵێكی بێگانەی تێدا نییە، بەڵام پێـی لێ ئەنێم كە تەنها لەجل و برینەكەیدا دەستی منی تێدایە، كاڵاكەی والایەكی منی تێدا نییە، هـی یەكێكـە لـە پێگەیشتوو، تێگەیشتوو، بەشەوق، پڕ شەوقەكانی وەتەن، كەواكەی بەری سەرو بەرە سـەركەوێ، بەركـەوێ، ئـەو منی هێنایە سەر سەودای كوردی پەتی نووسین، بەسۆزێكی زۆرەوە ئەیویست نووسینمان چاك و ڕێك و پێـك بـێ، تێكەڵ و پێكەڵ نەبێ، گوڵ بێ، پەیكوڵ نەبێ، بەچرای خۆمان بەرێدا بڕۆین، بەرێوە بچین، لەم دیارەدا ئەمەلەمەوە دیاری داوە، دیارە ئەبێ بكرێ بە دیاری (ئەو) (*) خوا یاربێ )) [٣]، بەم بەیتانە دەست پێ دەكات:

١ـ ڕۆژنامەی كورد تعاون و ترقی غزتەسی، ژ (٢) ی ٢٩/تشرینی دووەمی / ١٩٠٨.

٢ـ ڕۆژنامەی ژیانەوە، ژ (٣٤) ی ٦/ئاب/١٩٢٥.

(*)مەبەست لە ( ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ ) ە، ساڵی (١٨٩٨) لە سلێمانی لەدایك بووە، دووجار كراوەتە موتەسەریفی سلێمانی، جاری یەكەم لە ١٩٢٥/٣/٧، لە ڕۆژی ١٩٢٦/٤/١٣ بەسەرۆكی ( جەمعیەی زانستی كوردان ) هەڵبژێردرا و ڕۆژی ١٩٣٠/٩/٢٨، كرایەوە بە موتەسەریفی سلێمانی تا ١٩٣٥/٤/٢٤. بروانە: دیوانی پیرەمێرد، نووسینی محمد ڕەسول (هاوار)، بەغدا، چاپخانەی العانی، ١٩٧٠، ل١٠٨. هەروەها بروانە: ڕۆژنامەی ژیان ژ ١ــ٨١، ئامادەكردنی ڕەفیق ساڵح و لێكۆڵینەوەی سدیق ساڵح، یەكەم بەرگ، سلێمانی، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٢، ل٢٨ .

٣ـ ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٤٥) ی ١٩٢٦/١٢/٩.



**ئەستێرە بەرزەكانی كە وا شەوق ئەدەن بە شەو**
**وەك من بەداخەوەن نەسرەوتیان هەیە نە خەو**
**چەند ساڵە ئاشنای شەوی بێداری یەكترین**
**وەك سەرسەرین، شەوێ سەرناكەینە سەرسەرین** [١]

وەك دیارە كێشی ئەم دەقە عەروزە كە لە كلاسیكییەكانی نزیك دەكاتەوە، بەڵام چ قافیەكـەی كە (مەسنەوی ) یەو چ بەزمانەكەی كە كوردیەكی تەواو پەتییـەو چ بـەو وێنانـەش كـە بـەو زمانـە پەتییەش چنراون دەقێكی داهێنراوەو دەكرێ بە دەقێكی ڕێچكە شكێن لەمێژووی شیعری كوردیـدا دا بنرێ، هەر بۆیە ( ڕەفیق حیلمی ) دەربارەی ئەم دەقە دەڵـێ: (( پیرەمێـرد هـەروەك لـە شـیعرەكانیا لاسایی كەسی نەكردۆتەوەو بەڵكو ویستویەتی كە خـۆی ببـێ بـە ئیمـامی شـاعیرە كوردەكـانی ئـەم عەسرە، لەلایەكی تریشەوە لە شیعرا كوردی پەتی تاقیكردۆتەوە، بـۆی دەرخـستین كـە زمانەكـەمان زمانێكی دەولەمەندو شیرینە )) [٢]، گەلێ لەنووسەرانی تر دەربارەی ئەم دەقـە سـەرنج و تێروانینـی خۆیان دەربریوە ئەوە ( عەلادین سجادی ) دەربارەی ئەم دەقە دەڵێ: (( ئێمە كە سەیری سەردەمی ئەم هۆنراوانەو سەردەمی پێش پەیدابونی ئەو هۆنراوانە دەكەین بەتەواوی بۆمان دەردەكەوێ كە شۆرشێكی ئەدەبی لە ئەدەبی كوردیدا پەیدا كردووە )) [٣]، هەر دەربارەی ئەم دەقـە ( د. ئیحـسان فـۆاد ) یـش دەڵێ: (( هەر لەبەر ئەمەیش ئەم هۆنراوەیە یەكێكە لـەو نموونانـەی كـە لـەو سـەردەمەدا ڕێـچكەی شكاندووە كەم و زۆر كاری كردۆتە سەر تاقیكردنەوەی شاعیرانی هاوچەرخ )) [٤].

بەگشتیش دەربارەی ئەم ڕێچكەنوێیەی پیرەمێـرد وتـراوە كـە پیرەمێـرد بەرووكردنـە فولكلـوری كوردی و شیعری هەورامی ئەو نوێگەریەی لە شیعری كوردیدا كردۆتـەوە، پێـشەكی ئـەم رایـەش لـەناو نووسەرانی كوردا بێگومان (گۆران) ی شاعیر بووە كـە دەڵـێ:(( شـیعری پیرەمێـرد فولكلـوری كـوردی هەڵبەستی شێوەی گۆران تەئسیری تێ كرد )) [٥]، بێگومان ئەم بۆچـوونەش ڕاسـتە، هەربۆیـە دەتـوانین

١ـ ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٤٥) ی ١٩٢٦/١٢/٩.

٢ـ ڕەفیق حیلمی، شیعرو ئەدەبیاتی كوردی: ١/٩٠.

٣ـ عەلادین سجادی، ئەدەبی كوردی و لێكۆڵینەوە لە ئەدەبی كوردی، بەغدا، چاپخانەی مەعاریف، ١٩٦٨، ل٣٠٣.

٤ـ د. ئیحسان فۆاد، سەوداو سنوور، سلێمانی، چاپخانەی روون، ٢٠٠٠، ل١٨٤.

٥ـ عبدالرزاق بیمار، دانیشتنێك لەگەڵ گۆران، گۆڤاری بەیان، ژ (٢) ی شوباتی ١٩٧٠، ل٣.

بلێین فەرهەنگی شیعریی پیرەمێرد بەسیما کوردیە پەتییەکەیەوە زیرەکانە و وشیارانە بەو دانەزمانیانە دەوڵەمەندکراون کە بەشێکیان لە فولکلوری کوردی و بەشێکیان لە شیعری هەورامی بەتایبەتی لە (مەولەوی) یەوە هەڵێنجراون، ئەمە سەرباری دەوڵەمەند کردنی فەرهەنگە شیعرییەکەی بەو وشەو دەربڕینانەی کە راستەوخۆ لە فەرهەنگی زمانی کوردییەوە گواستونیەتیەوە ناو فەرهەنگە شیعرییەکەی.

وەك ئاشکرایە پیرەمێرد کاتێ کە لەئەستەموڵ بووە (مەولەوی) لەلای بۆتە هەوێنی چێژی شیعری، هەربۆیە گەلێ لەدەقەکانی وەرگێراوەتە سەر زمانی تورکی و بەڵام هێشتا دڵی بەو وەرگێرانە ئاوی نەخواردۆتەوە بۆیە دەڵێ: (( ئەو گیانە بڵندە لەو گۆرە تەنگەدا نەدەگونجاو دانە دەمرکاو ئەو ئارەزووەم هەر لەدڵدا مایەوە تا هاتمەوە )) [1]، کە هاتیشەوە کوردستان هەروەك ( د. دلشاد عەلی ) دەڵێ: (( بەوەرگرتنی راستەو خۆی وێنە شیعرییەکانی (مەولەوی) بووبێ یان بەسوود وەرگرتن بووبێ لە کەرەسە بیری و هونەرییەکانی مەولەوی،، تاقیکردنەوە شیعرییەکانی خۆی دەولەمەند کرد))[2].

بێگومان بەو کاری گەربوونەش بە دەقەکانی (مەولەوی) یەوە گەلێ وشەو دەبرینی لە (مەولەوی) یەوە وەرگرتووە و لەبنیاتی دەقەکانیدا بەکاری هێناون وەك ( بادەی خەم ـــ مەرگی ناکامان و پرزامان ــ ناسۆر ــ نەوجەوانی ــ زیندەگانی ــ شەتاو ــ چەمەرەداران ـــ سەوڵی خەرامان ــ قەتار ــ کە ناچەی پۆر ــ هەردەی دوجەیل ــ جەور ــ فەلاکەتکێشان ــ دەرون پڕ ئێشان.... هتد )، دیارە وەرگرتنی ئەم وشە کوردیە رەسەنانە لە (مەولەوی) یەوە راستەوخۆ پێوەندی بەرووکردنە کێشی بڕگەیی و قافیەی مەسنەوییەوە هەیە کە بێگومان لە (مەولەوی) یەوە بەدەستی هێناون.

ئەو راستییەی لێرەدا دێتە بەردەستمان ئەوەیەکە لە (٢٤) دەقی بڵاوکراوەی پیرەمێرد لە نێوان ساڵانی (١٩٠٨ــ١٩٣٢) (٢٠) دەقی بەقافیەی (مەسنەوی) بووە، لەو (٢٠) دەقەش (١٤) یان کێشی عەروزین، واتە لەپاڵ کێشە عەروزیەکەشدا زیاتر هەر قافیەی مەسنەوی بەکارهێناوە.

بەم پێیە رووکردنە کێشی بڕگەیی، قافیەی مەسنەوی لەلایەن پیرەمێرد بۆ خۆی گەرانێ بووە بە دوای بنەماو هەوێنی رەسەنایەتیدا و چونکە هەروەك ( د. دلشاد عەلی ) دەڵێ: ( هەرچی گرنگی

١ـ ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، سلێمانی، دەزگای سەردەم، ٢٠٠١، ل٢٤٨

٢ـ د. دلشاد عەلی، دیاردەی کاریگەری مەولەوی لەسەر شاعیرانی کرمانجی خواروو ( پیرەمێرد، گۆران، دیلان )، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، ژ (٥) سالی ٢٠٠١، ل٧١



دانی شاعیرانی سەربە رێبازە نوێیەکەی هەڵبەستی کوردیشە بە بنیاتی مەسنەوی بۆ خۆی ئەنجامی بوژانەوەی کێشەکانی بڕگەی کوردی بووەو هەربەم هۆیەشەوە بووە کەنەك هەر قافیەی یەکگرتوو بەڵکو بەرەنگاری چەمکە کۆنەکەی قافیە و سەرجەم ئاوازە کۆنەکانی تری هەڵبەست بوونەوەو گۆڕانی دیارو ئاشکرایان تیادا کردن و بنیاتی نوێ تریان لێ پێك هێنان، بەواتایەکی تر گەڕان بەدوای رەسەنایەتیدا بەرەو قافیەی مسنەوی بردنەوە هەروەك چۆن بەرەو بەکارهێنانی کێشی بڕگەیی بردن )) [1].

هەر ئەودەرگا کردنەوەیەی پیرەمێرد لەسەر مەولەوی تا گیانی شیعریی خۆی پێ تێر ئاو بکات، بووە مایەی ئەوەی کە راستەوخۆ لە فەرهەنگی زمانی کوردی خۆیەوە وشەی رەسەن هەڵێنجێ لە بنیات نانی دەقەکانیدا و هونەرمەندانە بەکاری بهێنێ و بیکاتە دانەی فەرهەنگە شیعرییەکەی، ئەو فەرهەنگەی کە بووە سەرچاوەیەکی رەسەن بۆ شاعیران و نووسەرانی ئەوسەردەمە، هەر لێرەدا دەکرێ ئەم راستییە بەخستنە رووی ئەم وشەو دەربڕینانە دەرخەین کە تەنها لەو (٢٤) دەقەی نێوان ساڵانی (١٩٠٨ــ١٩٣٢) دا بەکاری هێناون:

لە شیعری (ئەمرۆ) ی ساڵی ( ١٩٠٨) دا ئەم وشەو دەربرینانە دەبینرێن ( چلەخانە، گەلان، میللەت، دەنگ، رەنگ، سەپانی شێخ، خەزوور، لات و هەتیو، چارە، یەکێتی، خۆر، پەسەند، یەك کەوین، دەوار و ماڵ، کارەکەر، نیشتمان، رزگاری، زۆردار، پەرێشان، یاد ) و دەڵێ:

**ئەمرۆ کە رۆژی جەژنی هەموومانە سەربەسەر**
**کوردیش لەگەڵ گەلان لەچلەخانە هاتەدەر**

— — — — — — — — — — — —

**میللەت نە دەنگ و رەنگی خەلیفەی ئەدی و ئەبیست**
**مەزلووم چ حەدی بوو، بەشکات دەنگی بێتە دەر**
**عالەم کۆ بووبوە خزمی خەزوری سەپانی شێخ**
**کورد دەستی کورت بوو، نۆبەێی نۆ بەی نەکەوتەبەر**[2]

١ـ د. دلشاد عەلی، بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا، سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ١٩٩٨، ل١٠٦.

٢ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/٢١٣.

له شیعری ( لەسەر بەردێ ) ی ساڵی (١٩٠٨) یدا ئەم وشەو دەربرینانە دەبینرێن( هەڵفڕی، خەرۆ، بڵند، گیڤ کرد، خولیا، رەنگین، دڵ بریندار، گەوزی، خۆمان بە خۆمانی دەکەین، هەرگیز، خۆیەو لەخۆمانە، کەچ بین ) و دەڵێ:

**لەسەر بەردێك هەڵۆیەك هەڵفڕی کەوتە هەوا بێغەم**

**هەوایێکی غروری کەوتە سەر تاکەوتە سەر عالەم**

**بەبایەکی خەرۆ بایی بوو خۆی هێجگار بڵند زانی**

**پەری گیڤ کرد و باڵی لێك ئەدا هەتاکوو ئەیتوانی** (١)

له شیعری ( له گوێم دێ دەنگی لایلایەی وەتەن ) کەی ساڵی (١٩٢٥) دا ئەم وشەو دەربرینانە دەبینرێن ( لایلایەی وەتەن، جگەر سووتاو، وێرانە، خوێناو، لاوانەوە، سەری شینە، ماتەم، کۆتەڵ، گەردش، پاداشت، گەوهەردار، میروگزیر، ناڵە، پەشێواو، رووشان، قووچ، نائومێدی، سەرمەست، نوشی، پۆشی، پایتەخت، کەمەند ) و دەڵێ:

**له گوێم دێ دەنگی لایلایەی وەتەن، دایك جگەرسووتاو**

**دەرێژن بەسەر وێرانەکەی خوێناویا خوێناو**

**ئەلاوێنێتەوە ئەگری سەری شینە لەماتەمدا**

**شەوو رۆژ کۆتەڵی منداڵەکانی وا لەبەر دەمدا** (٢)

له شیعری ( دوێ شەو لەسەر چڵێکی گوڵێ ) ی ساڵی (١٩٢٦) ا چەند وشە و دەربرینێکی تیا بەدی دەکرێ ( چڵ، نەگبەتی، رەنج، دەست بەدەستەوە، یەك دڵ، خەملێن، دڵسۆز، مەینەت، شاباش، سێبەر ) و دەڵێ:

**دوێشەو لەسەر چڵێکی گوڵێ، بولبولێ وتی:**

**وا دەی بەهاری کوردە نەما رۆژی نەگبەتی**

— — — — — — — — — —

**چەند خۆشە دەست بە دەستەوە یەك دڵ لە ناوگولا**

**خەملێن وپێکەنینی دوو دڵسۆزی مەینەتی** (٣)

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٢/٢٧٩

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٢٨٤. هەروەها بروانە: رۆژنامەی ژیانەوە، ژ (٣٤) ی ٦/ئاب/١٩٢٥

٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٥٧. هەروەها بروانە: گۆڤاری دیاری کوردستان، ژ (١٣ــ١٤) ی ساڵی ١٩٢٦



له شیعری ( بەرز و بڵندە ) ی ساڵی (١٩٢٦) دا ئەم وشەو دەربرینانە دەبینرێن ( بڵند، رەهێڵە، نەوا، شەستە، گەوهەر، تەرزە، زوقم، گوڵشەن، گۆشە، بێشە، هەوری بەهاری بگری، شکۆفە، دەپشکوێ ) و دەڵێ:

**بەرز و بڵندە هێند دەرەجەی خاکەکەی وەتەن**

**هێشتا بە هاری ئێمە نەهات سەوز نەبوو چەمەن**

**چوار لا بەهارە، بەزمە نەوای سازو زیلەیە**

**لای ئێمە شەستە، سەر بەکڵاوەو رەهێڵەیە** (١)

له شیعری ( ئەوا رووم کردە تۆ ) ی ساڵی (١٩٢٦) دا چەند وشەو دەربرینێکی تیا دەبینرێ ( بۆنی وەتەن، سروە، گزنگی رۆژ، بریقە، ئاوات، دەنگی منالانی قوتابخانە، میللی، تاریکی نەزانین ) و دەڵێ:

**بەیانی دا نەسیم لای تۆوە هات، بۆنی وەتەن پێوە**

**ئەوا نووسرایەوە پیرانە سەرعومرم لەسەر نوێوە**

**ئەڵێن نەفحەی حەیاتی پێوەیە بادی بەهار وایە**

**بەسروەی بای وەتەن ماوم بەهارو بای لەلام بایە** (٢)

له شیعری ( عابیدێ کونجی مزگەوتێکی گرت ) ی ساڵی (١٩٢٦) دا ئەم وشەو دەربرینانە دەبینرێن ( دراوسێ، ببوژێتەوە، گری برسێتی، دڵێکی تێر، له خەم برخسێ، ئایندە، شای کوردەواری، جێنشینی، فریو ) و دەڵێ:

**بەڵکو تێر بخوا ببوژێتەوە**

**گڕی برسێتی بکوژێتەوە**

**بە دڵێکی تێر بۆ شەو نوێژ هەڵسێ**

**بە دووعای خەڵك لە خەم برەخسێ** (٣)

له شیعری ( مام چەوەندەری زیرینوکی ) ی ساڵی (١٩٢٦) دا ئەم وشەو دەربرینانە دەبینرێن ( پێپیلکە، ئاڵتون لەسەر، خەپلە، پەلار، رۆژان، داقڵیشاو، بووژایەوە، مزگێنی، مستەکۆڵە ) و دەڵێ:

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/٣٠٢

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ١/٢٣٨

٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/١٧٩.

**به پێپیلکه چووه خوارێ          هەر رۆیی تا گەییە غارێ**

**حەوت کوپەی ئەلماس و گەوهەر          کەلەشێری ئاڵتون لەسەر**

— — — — — —          — — — — — —

**کەوتە شوێنی بەپلارێ          چشتەی لەدەم خستە خوارێ**

**روانی منداڵێکی پچووکە          چاو قلیشاو، وەك جنۆکە** [1]

لە شیعری ( پـێ هەڵخزانـە ) ی سـاڵی (١٩٢٦) دا ئـەم وشـەو دەربرینانـە دەبینـرێن ( پـێ هەڵخزان، زوقم، لەشكری زستان، گورد، كلێشە ) و دەڵێ

**ئەم خاكە بەرزە فێرە بە زوقم و بە بەفروبا**

**بادی بەهاری لەشكری زستان ئەدابەبا**

— — — — — — — — —

**ئەم كوردە گوردە ناوی لەناو ناچێ مایەوە**

**رۆژی دەبێ بە بابانەوە، بێتە كایەوە** [2]

لە شـیعری ( ئەسـتێرە بـەرزەكان ) ی سـاڵی (١٩٢٦) دا ئـەم وشـەو دەربرینانـە دەبینـرێن( ئەستێرە، شەوق، سرەوت، ئاشنا، بێدار، شەونم، چیمەن، بەری بـەیان، كەسـاس، دۆسـت، فرمێـسك، ئاونگ، شەونم لەسەر گیا، پریشك، دوكەڵ، هەناسە ) و دەڵێ:

**شەو شەونمی ئەوان چەمەن ئاو ئەخواتەوە**

**رۆژ هەڵمی ئاوی چاوی منە سەر یەخاتەوە**

— — — — — — — — — —

**دڵسۆزی وام نەدیبوو كە بۆم بگری وەك غەشیم**

**فرمێسكەكەی ئەوان بو بە ئاونگی تێ گەییم** [3]

لە شیعری ( شەوێ لە گوێ شەتی بەغدا ) ی ساڵی (١٩٢٦) دا ئەو وشەو دەربرینانـە دەبینـرێن (باڵی شیعر، خولیا، رەنجەرۆ، خاك، سەرەرۆ، چەم، تەم، تاڤگە، پریشك، تونێل، تێیتەقان ) و دەڵێ:

---

١ـ فایەق هوشیار و هاورێكانی، دیوانی پیرەمێرد: ٢./٣٠١

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ١/٤٢٥

٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/١٩٢. هەروەها بروانە: رۆژنامەی ژیان، ژ (٤٥) ی ١٩٢٦/١٢/٩.



**بە باڵی شیعر و خەیاڵ كەوتمە پەلەو تەكوتاز**

**لە ئەسمانی سەرفرازی هاتمە پەرواز**

— — — — — — — — —

**بە تاڤگەكەی سەری (زەڵم) بۆچ نەڵێم (نیاگارە)**

**ئەوەندە بە فەیزە، پریشكی كەفی گەوهەربارە** [1]

لە شیعری ( نەسرین گوڵی نەسرینە ) ی ساڵی (١٩٢٨) دا ئـەم وشـەو دەربرینانـە دەبینـرێن (چوزەرە، خنجیلە، خوێن شیرین، شنە شن، لێو ئاڵ، خوازبێنیكەر، چاو خومار، فریشتە، پـەری زادە، گوڵ ئەستێرە، گەزیزە، ئازیز، كەنیزە، شەوچەرە، چلوورە ) و دەڵێ:

**نەسرین گوڵی بەهارە          لێو ئاڵە چاو بە خومارە**

**لە ناوكچاندا دیارە          خوازبێنیكەر هەزارە**

— — — — —          — — — — —

**نەسرین گوڵی هاوینە          فریشتەی سەر زەمینە**

**پەریزادەی ماچینە          گوڵ ئەستێرەی زێرینە** [2]

لە شیعری ( وا دەمـی دەورەی رەواحـە ) كـەی سـاڵی (١٩٢٩) دا ئـەم وشـەو دەربرینانـەش دەبینرێن ( ئاڵ، سوور، مۆر، سوورمە، گرمەگرم، سرەوتن، سامال ) و دەڵێ:

**هەردە ئاڵ و سوور و مۆرە، وەك كەوای سورمەی عەروس**

**گوڵ گەڵای لوول كردووە، وەك تورەی دڵداری رووس**

— — — — — — — — — — — —

**گرمە گرمی هەوری دوور دێ كێ دەڵێ دڵ دەسرەوێ**

**رۆحی عولوی كورد، سەمای ئامالی سامالی دەوێ** [3]

---

١ـ فایەق هوشیار و هاورێكانی، دیوانی پیرەمێرد: ٢/١٥٩.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٣٣٢.

٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ٣/١٤.

له شیعری ( وەفدی کوردستان ) ەکەی ساڵی (١٩٣٠) دا ئـەم وشـەو دەربڕینانـە دەبینـرێن ( وەتەن فرۆشان، هەرزە، شاری خامۆشان، تارا، کوشتار، دڵگیر، شەرمەزار، گوڵ ڕەنگ، نەنگە، بەرات، مـوژدە، بەیداخی خوێنین ) و دەڵێ:

**وەفدی کوردستان وەتەن فرۆشان**

**هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان**

— — — — — — — —

**ئێوە ئەو عەرشەی بە خوێن گوڵڕەنگە**

**سوجدە بۆ دەبەن هیچ ناڵێن نەنگە** [1]

له شیعری ( مستۆ وادیارە ) کە شیدا ئەم وشەو دەربڕینانە دەبینرێن ( ئەسـتۆ، ئـەخورێ، بـێ هاوتا، بەیداخی کوردی، ئازاد ) و دەڵێ:

**مستۆ وا دیارە تۆش جل خوار ئەکەی**

**ئەستۆت ئەخورێ و مەیلی باری ئەکەی**

— — — — — — — — — — —

**ئێمە کە کوردین لەلامان وایە**

**کوردی زبانێکە زۆر بێهاوتایە** [2]

له شیعری ( سبەینێ بوو لە خەو هەستام ) ی ساڵی (١٩٣٢) دا ئەم وشەو دەربڕینانە بەدی دەکرێن ( تارای زیوین، موژدە، شەرە تۆپەڵ، شێرە بەفرینە، نسێ، زین، دڵبەر، فریشتە، ساماڵ، ڕۆژهەڵات، تەفرە، کڵۆی بەفر، گۆنا، بریسکە، خشڵی زێرین، تویژاڵ، پڵپڵە، سەهۆڵ، سەرو پۆیلە ) و دەڵێ:

**سبەینێ بوو لەخەو هەستام کە روانیم بەفرە باریوە**

**سلێمانی ئەڵێی بەڵقیسە تارای زیوی پۆشیوە**

**دەمێکە چاوەڕێی بەفرێکی وابووم موژدەبێ باری**

**سەرم بەفرە کەچی هێشتا شەرە تۆپەڵمە بۆیاری** [3]

١ـ فایەق هوشیار و هاوڕێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/٢٤.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ١/٣١٠.

٣ـ ڕۆژنامەی ژیان، ژ(٣١٢) ی ١٩٣٢/٢/٢٥. هەروەها بروانە: دیوانی پیرەمێرد: ١/٣١٤



له شیعری ( دوێنی بەیانی چومە قەراغ شـار ) ی سـاڵی (١٩٣٢) دا ئـەم وشـەو دەربڕینانـە دەبینرێن ( ورشە، ئاونگ، تیشکی هەتاو، بووك، شنەی با، خونچە، پەچە، ئاواتـە خـواز، گریـشمە، ناز، هەمیشە بەهار، لاگیرە، سەرپەرچەم، خنجیلانە، شیلانە، دڵخوزار، ئەگریجە، چنوور، تارای سوور، ئەرخەوان، بە لەنجەو لار، گولزار، مەڵبەند، چاوی قرژانگ، چۆپیکێش، شینپۆش، دڵبەند ) و دەڵێ:

**لەورشەی ئاونگ بەتیشکی هەتاو**

**گوڵ چووبووە شێوەی بووکی سەر بەدراو**

**شنەی بای بەهار، ئەیدا لە خونچە**

**ئەیگەشاندەوەو لای ئەدا پەچە**

**نەك دڵێ سەد دڵ ئاواتە خوازی**

**ئەو پێکەنینەو گریشمەو نازی** [1]

له شیعری ( ڕۆژی تازەی ساڵی تازەی ) ی ساڵی (١٩٣٢) دا ئەم وشەو دەربڕینانە دەبینـرێن ( ڕۆژی تازە، چاوی مەست، شەونمی ناولالە، شەیدا، سۆز، گولزار ) و دەڵێ:

**بای بەهار هات خاکی زیندوکردەوە**

**بۆیە نێرکس چاوی مەستی کردەوە**

— — — — — — — — — —

**شەونمی ناو لالە بادەی بولبولە**

**بەومەیە سەرخۆشە وا شەیدای گوڵە** [2]

له شیعری ( دانیشتبوین لەگەڵ یار ) ی ساڵی (١٩٣٢) دا ئەم وشەو دەربڕینانە دەبینـرێن ( سەرمەسـت، هوشیار، تیلەی چاو، بیمار، ترازان، لێوی خاڵدار، بەختیار، دڵشاد، گوڵنار، نێچیر، بناوان، دڵ ئازار ) و دەڵێ:

**دانیشتبوین لەگەڵ یار     من سەرمەست و ئەو هوشیار**

**بەتیلای چاوی بیمار     دڵمی فراند بەیەکجار**

**شوێن دڵم کەوتم ناچار** [3]

١ـ فایەق هوشیار و هاوڕێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٢/٥٨

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٨٦

٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/١٢

له شیعری ( وا بەیانە گزنگی رۆژ دەرکەوت ) ی ساڵی (١٩٣٢) دا ئەم وشەو دەربرینانە دەبینرێن ( گزنگی رۆژ، نمی شەونم، خونچە، شۆر، تارا، پەری شاخان، فریشتە ) و دەڵێ:

**وا بە یانە گزنگی رۆژ دەرکەوت**

**نمی شەونم بەتیشکی خۆرسەرکەوت**

**خونچە گوڵ خونواندنی بەرکەوت**

**بولبولیش شۆری خستە ناوگوڵزار**[1]

دیارە کاتێکیش دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی پەندەکانی لەسەر لاپەرەی رۆژنامەی ژیان و ژین توانی سەدان وشەی کوردی پەتی رەسەن بێنێتە ناو فەرهەنگی شیعری کوردییەوە هەروەك ( د. محەمەد نوری عارف ) دەڵێ: (( پیرەمێرد بە پەرۆشەوە بەدوای وشەی رەسەنی کوردیدا گەراوە، لەهەر شارو دێ و ناوچەیەکی کوردستاندا ئەگەر وشەو دەربرین و بەسەرهات و سەرگوزشتەو پەندو نەریتێکی کوردەواری بەرگوێ بکەوتایە یەکسەر دەیقۆستەوەو گەنجینەی ئەدەبەکەمانی پێ دەوڵەمەند و رازاوە دەکرد، ئەگەر پیرەمێرد لەم زەمینەیەدا بەراورد بکەین لەگەڵ شاعیرانی هاوتەمەنی خۆیدا دەبینین ئەو وشەو زاراوانەی کە ئەوان بەکاریان هێناوە تارادەیەکی زۆر ئەمیش بەکاری هێناون، بەڵام گەلێ وشە و زاراوەی تر هەن کە پیرەمێرد بەکاری هێناون و تایبەتین بە خۆی و ئەوان نەهێناوە لە شیعرەکانیاندا، خۆ ئەگەر بەکاریشیان هێنابن ئەوا دانە دانە و یەکجار کەم و دەگمەنن))[2].

بەم پێیە دەتوانین لێرەدا بڵێین پیرەمێرد وەك رابەرێکی رێچکەشکێن و دەنگێکی نوێخوازو نوێکەرەوەی شیعریی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا توانی جێگای خۆی بکاتەوە.

## ٢ ــ وێنەی شیعری لە دەقە شیعرییەکانی پیرەمێرد دا

وێنەی شیعری لە زمانەوە دروست دەبێت بەو پێیەی کە بنەمای هونەری دەقی شیعری پێش هەموو شتێ زمانە، وێنە لە رەخنەی ئەدەبیدا بە ( image ) ی ئینگلیزی ناودەبرێت، ئەمەش هاوبەشە لەگەڵ وشەی ( imagination ) کە بەمانای ئەندێشە دێت بەو مەبەستەی کە پێوەندییەکی

---

١- فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/٨

٢- د. محەمەد نوری عارف، وشەو زاراوەکانی پیرەمێرد ــ لێکدانەوەو بەراوردو شیکردنەوە، بۆچوون و رونکردنەوە، گۆڤاری ئەکادیمی ( گۆڤاری کۆری زانیاری کوردستان )، ژ (١) ی ساڵی ٢٠٠٢، ل٣٢٦.



بەهێز هەیە لە نێوان ئەندێشەو وێنەدا [1]، چونکە سەرچاوەی وێنە ئەندێشەیەو وێنە بۆ خۆی ((پێکهاتەیەکی زمانەوانییە، خەیاڵی هونەرمەند لە چەند سەرچاوەیەکەوە دروستی دەکات کە جیهانە هەست پێکراوەکە لە پێشەوەی ئەوانەوەیە، زۆربەی وێنەکان لەهەستەوە وەرگیراون هاوشان لەگەڵ ئەو وێنە دەروونی و ژیریانەدا کە ناتوانرێت پشت گوێ بخرێن، هەرچەندە وێنە هەستیەکان بەزۆری نایەن، یان شاعیر زۆرجار لەوێنەی هەستیدا پێشکەشیان دەکات )) [2].

دیارە گرنگی وێنە لەوەدایە کە راستەوخۆ بۆتە رەگەزێکی سەرەکی سازدانی چەمکی شیعر لەسەرجەم قۆناغەکانی مێژووی ئەدەبی میللەتاندا [3]، هەربۆیە( هیوم) دەڵێت(( شیعر خۆی مەسەلەی وێنەو خوازەیە، خوازەش واتا هەست پێکراوەکان دەگۆرێت بۆ وێنە..... وێنەکانیش لە شیعردا تەنها متوموورووی جوانی نین بەڵکو گەوهەری زمانی شیعرن و ئەوەن کە زمانی شیعر لەزمانی پەخشان جوێ دەکەنەوە )) [4]، دیارە وێنەی شیعریش بۆخۆی رەنگ پێ دەرەوەی هەست و سۆزی شیعرییە هەر بۆیە ( س. دی. لویس) دەربارەی وێنە دەڵێ: (( توانای بارگاویی کردنی وشەیە بە هەست و سۆز )) [5]، هەروەها وتراوە کە وێنە (( گواستنەوەی بیرۆکەیەکە یا سۆزێکە لەساتە وەختێکدا )) [6].

---

١ـ بروانە: سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوردیدا (١٩٧٠ــ١٩٩١ )، سلێمانی، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٤، ل٢٥؟

٢ـ د. علی البطل، الصورة فی الشعر العربی، دراسة فی اصولها وتطورها، بیروت، دارالاندلس، ١٩٨٠، ص٣٠.

٣ـ بروانە: د. جابر احمد عصفور، الصورة الفنية فی التراث النقدی البلاغی، القاهرة، دار الثقافة للطباعة والنشر، ١٩٧٤، ص٧. هەروەها بروانە: د. كمال ابوديب، جدلية الخفاْ والتجلي، ط١، بیروت، دار العلم للملايين، ١٩٧٩، ص١٩. هەروەها بروانە: د. جوزيف ميشال شريم، دليل الدراسات الاسلوبية، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، ١٩٨٤، ص٦٤ــ٦٥.

٤ـ ديڤيد ديتش، منا هج النقد الادبی، ترجمە محمد يوسف نجم، بیروت، دار صادر، ١٩٦٧، ص١٤٦

٥ـ سی. دی. لويس، الصور الشعرية، ترجمة د. احمد نصيف الجنابی و مالك ميری و سلمان حسن ابراهيم، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٢، ص٢٣.

٦ـ د. احسان عباس، فن الشعر، بیروت، دار بیروت للطباعة والنشر، ١٩٥٩، ص٩٠.

هەرچی دەربارەی بنیات نانی وێنەشە ئەوا لەگەڵ ئەوەی رای جۆرا و جۆر دەربارەی کەرەسەکانی بنیاتنانی خراونەتە بەر دەست، بەڵام هەموو تێروانینەکان لەوەدا یەك دەگرنەوە کە بنەمای پێکهێنانو بنیاتنانی وێنەی شیعری هونەرەکانی رەوانبێژییە بەتایبەتی ( لێکچواندن و خواستن و خوازە و درکە ) هەر ئەمەش بۆتە بنەمای ئەو راستیەی کە نابێ وەك هونەرێکی رازاندنەوە لەرەوانبێژی بروانرێ بۆیە ( د. دڵشاد عەلی ) دەڵێ: (( لەگەڵ ئەو رۆڵە گرنگەی هونەری رەوانبێژیدا، ئەوەی سەرنج رادەکێشی ئەوەیە کە نەك هەر لە ئەدەبی کوردیماندا بەڵکو لەزمان و ئەدەبی بەرفراوانی وەك زمانی ئینگلیزیشدا زۆر جار وەك بابەتێکی رازێنەرەوەی رووت و بێ بایەخ لەو هونەرانەی رەوانبێژی روانراوە، ئەوەتا (ئارشیبالد ماکلیش) لەم رووەوە دەڵێ: (( لەو وڵاتەی کە ئینگلیزی قسەدەکەن لای خوێنەرانی شیعر وا باوەو گیرۆدەی ئەو بۆ چوونەن کە وێنەی ناو قەسیدە تەنها بۆ رازاندنەوە یە، بۆیە دەبێت جوان بێت)) [1].

هەرچی دەربارەی جۆرو چەشنی وێنەی شیعرییە ئەوا بەگەلێ شێوە وێنەی شیعری پۆلێن کراون، لە لێکۆڵینەوەکانی شیعری کوردیدا نووسەرانمان بە سوود وەرگرتن لە سەرچاوە عەرەبی و بیانییەکان بەچەند شێوازێ وێنەی شیعریان پۆلێن کردووە، بۆ نموونە ( فاچل مجید محمود ) باس لە وێنەی بینراوو زەینی و خوازەیی و رەمزی دەکات [2] هەروەها ( سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی ) بەپێ ی ئاستی پێکهێنانیان وێنەی تاك و لێکدراو گشتی دیاری دەکات، لەرووی هەستی ژێریەوە وێنەی هەستی و وێنەی واتایی دیاری دەکات، لەرووی وەستان و جوڵانەوە وێنەی وەستاو و جوڵاو دیاری دەکات، یاخود بەپێ ی شێواز وێنەی رەمزی و ئەفسانەیی دیاری دەکات [3] بێگومان ئەو جۆرە پۆلێن کردنانەو دیاری کردنی ئەو چەشن و جۆرانەی وێنە بۆ خۆیان سوود مەندن و دەکرێ بە دیاری کردنیان لە دەقی شیعریدا گەلێ لایەنی تاقیکردنەوەی شیعریان پێ رون بکرێتەوە.

بەڵام ئێمە لێرە دا وای بە پەسەند دەزانین کە بەپێی ئەو سەرچاوەیەی کە وێنەی شیعری لێ بەدەست دەهێنرێ و بنیاتی دەقی شیعری پێ دەچنرێ لەوێنە شیعرییەکانی پیرەمێرد بکۆڵینەوە

١ـ د. دلشاد عەلی، دیلان و تاقیکردنەوەی شیعری، سلێمانی، دەزگای چاپ و بەخشی سەردەم، ٢٠٠٧، ل١٧٠

٢ـ بروانە: فاضل مجید محمود، سروشت لە شیعری گۆراندا، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٧، ل١٤٦ــ١٤٧.

٣ـ بروانە: سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوردیدا (١٩٧٠ــ١٩٩١): ل١٠ــ١١.



تابتوانین سیماو شەقڵی نوێی وێنەکانیش دیاری بکەین، بەم پێیە هەوڵ دەدەین سێ جۆری وێنە لە دەقەکانی پیرەمێرد دا دیاری بکەین کە بریتین لە وێنەی خۆماڵی و وێنەی ناوچەیی و وێنەی جیهانی.

### أــ وێنە خۆماڵی

پێش هەموو شتێ سروشتی کوردستان بۆ پیرەمێرد بوو بوە سەرچاوەیەکی دەولەمەندی بەدەست هێنانی وێنەی شیعری لێیەوە:

**هەوری بەهار لە گەردو خولدا**
**چیمەن گەردانەی شەونم لە ملدا**
**لاگیرەی زێرە قەتارەی گوڵزار**
**هەیاسەی پشتە زنجیرەی رووبار** [1]

لەو چەند بەیتەدا لە رێگای لێکچواندنەوە بە بەرامبەر پێکردنی وێنە و دیمەنەکانی سروشت بەوێنە و دیمەنی پۆشاکی کوردی ژنان کە بۆ خۆی وێنەیەکی شیعری نوێیە و ئەرکە کەشی تۆوکردنی خۆشەویستی کوردستانە لە ناو دڵ و دەروونی گوێگر و خوێنەری کورد دا و وێنەی جوانی بنیات ناوە.

دیارە هەر وەك چۆن لای زۆربەی شاعیران بەهار بۆتە سەرچاوەیەکی جوانیی، ئەوا هەر بەو جۆرەش پایز لەلایان بۆتە سەچاوەیەکی خەم و پەژارە، بەڵام لای پیرەمێرد بۆتە خەمێکی کوردانە نەك خەمێکی خودی رۆمانسیانە، هەروەك لەوێنەکانی ئەم دەقەیدا دەبیینین کە بە شێوازی خواستن و کەسێتی بەخشین بە زەڵم دەیچوێنێ بە بەختی کورد:

**ئاوە جوانەکەی سەرچاوەی زەڵم**
**بۆچ بەهار لێڵی و پایز سەربەتەم ؟**
**ئەڵێ ی سەرچاوەی بەختی کوردانی**
جێ بەخۆت ناگری وێڵی هەردانی
**سەرچاوەت سەربەرز ساردی وەك تەرزە**
**دانەت مرواری لەنجەت سەد تەرزە** [2]

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/٣٢٢.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو، ١/١٧٤.

هەر بەو ئەندێشە رەسەنەیەوە دەیان وێنەی جوان لە کەلتوری کوردەواری دەهێنێت و زیرەکانە دەقەکانی پێ دەچنێ وەك لە دەقی ( کزەی دەروون ) ە کەیدا دەیبینین و تیایدا دەڵێ:

**بە شەدەی لارو سەرپۆشی کەتان**

**وەك مانگ کەتانی جەرگیان ئەستووتان**

**وەك مانگ بە شەوی تاریکی دەیجوور**

**بورجی رەشماڵیان پڕ ئەکرد لە نوور**

**شەوی مانگە شەو ئاوایی خەوتن**

**لە دوای سرەوتن کاتی تێکەوتن**

**ئەولەش و لارە بە شڵپەی مەلە**

**دڵی دڵداریان ئەخستە پەلە**

**ئای بۆ پەریخان ناز داری جافان**

**ئاهووی رەز باهووی شیرین کلاّفان** (١)

لەو چەند بەیتەدا وێنەکانی شەدە و سەر پۆش و ڕەشماڵ و ئاوایی و تێکەوتن لەناو رووباردا بۆ کۆچەرەکان، هونەرمەندانە لە ژیانی کوردەواری خۆیەوە وەرگیراون، ئەو ژیانەی کە پیرەمێرد بەردەوام شەیدای بووە.

لە پاڵ ئەو وێنە و دیمەنە کە لتوریانە دا دەیان وێنەی جوان و مەبەستداریشی لە ژنانی سەردەمەکەیەوە بەدەست هێناوە:

**چیبکەم هەی هاوار پرچت براوە**

**داخم بوو بە دوو جەرگم سووتاوە**

**بەلاّم هێلانەی دڵ کە شێوا بێ**

**لێی گەرێ عومریش تەفرو تونابێ** (٢)

لێرەدا و بە بەرامبەر پێکردنی هەر دوو وێنەی پرچ و هێلانە وێنەیەکی لێکچواندنی جوانی سازداوە کە لە مۆدێلی نوێی کورتکردنەوەی قژی ژنانەوە وەری گرتووە با ئەو مۆدێلەشی بە دڵ نە بووبێ.

---

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٢/٥٢.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ١/٢٣٦.



گومانی تیا نییە کە کێشەی سیاسی نەتەوەکەی بۆ خۆی سەرچاوەیەکی تری دەوڵەمەند بووە بۆ پیرەمێرد تا وریایانە هەوێنی وێنەی شیعری لێ بە دەست بێنێ، لە دەقی ( من و ئەستێرەکان ) دا کە دەڵێ:

**من خواروو ژوور لە دەست چوەکەی بێولەت ئەوان**

**وەك خێڵی خواروو ژوورکەری کورد ، وێڵی ئاسمان**

**شەو شەونمی ئەوانە ، چەمەن ئاو ئەخواتەوە**

**رۆژ هەڵمی ئاوی چاوی منە سەر یەخاتەوە** (١)

بەو وێنانەی کە بە هونەری خواستن چنراون سۆزێکی کوردانەی رەسەن دەچۆرێنێتە دەروونی خوێنەر و گوێگرەوە و لەو دەقەدا ئەستێرەکان لەرێگەی خواستنەوە کراونەتە مرۆڤ، بۆیە شەونمیشی کردۆتە فرمێسکی خۆی و فرمێسکی ئەوانیش.

لەدەقی ( وەفدی کوردستان ) ە کەشیدا کە دەڵێ:

**وەفدی کوردستان وەتەن فرۆشان**

**هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان**

**چەپکێ لەو گوڵەی باخەکەی سەرا**

**کە بەخوێناوی میللەت ئاودرا**

**بیبەنە پێشکەش، عەرشی عیراقی**

**بڵێن: یار باقی هەم سوحبەت باقی** (٢)

( شاری خامۆشان ) وەك وێنەیەکی خوازەیی هەر بە تەنها واتای کپکردنی دەنگی کۆمەڵانی خەڵکی سلێمانی ناگە یەنێ لەلایەن رژێمەوە، بەڵکو هێماشە بۆ ئەوەی کە خەڵکی شار دەنگیان نەداوە بەو کەسانەی خۆیان کردۆتە نوێنەریان.

لە (نەورۆز) ەکە شیدا وێنەیەکی جوانی شۆرشگێرانە لە راپەرینەکانی جەماوەرەوە دەردێنێ و داهێنەرانە سنگی کچان دەکاتە قەڵغانی گولەی دوژمنان و دەڵێ:

---

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/١٩٢.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٣/٢٤.

**تا ئێستە رووی نەداوە لە تەئریخی میللەتا**

**قەڵغانی گوڵلە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا** [1]

لە دەقی ( کوردی رەوان ) ە کەیدا شێوەکارانە کۆمەڵێ تابلۆی جوانی کاتی بەفر بارینی سلێمانیو دەوروبەری دەکێشێ و بە کۆمەڵێ وێنەی خۆماڵی کە بە زمانێکی کوردی پەتی بنیات نراون ئەو شاکارە شیعرییەی دەخاتە بەردەست:

**ئەوا سامالی کردو رۆژهەلات کەوتە گلەزەردە**
**بەسەر ئەو بەفرە دا تیشکی هەتاو ئەلماسی خواکردە**
**بەسەر گۆنای سپیدا خشڵی زێرینە بریسکەی دێ**
**پەری سەر کێوی قافیش هێندە پرچی زەردی خۆی لێ دێ**
**بەسەر سەربان بەفر تویژالی بەستووە، وێنەی چورەشیرە**
**قەتارەی سەر لق و پۆپی درەختیش سپیە دڵگیرە**
**چلوورەی گوێسوانە، پلپلەی زیوی کچە کوردە**
**سەهۆڵ ئاوێنە یە، ئەم پلپلە و ئاوێنەیە وردە** [2]

هەر بەو کەرەسەو وێنە شیعریانەی کە لە شیعری فولکلوری و شیعری هەورامی وەرگرتوون، دەیان وێنەی هونەر مەندانە و جوانکاریانەی بنیات ناوە:

وتم: هەر پیرە جوان تێك ئەبەستێ
نەمام بەداری پیر رادەوەستێ [3]

بەگشتی دەتوانین بڵێین هیچ دەقێکی پیرەمێرد نابینرێ کە بە سوود وەرگرتن لەوێنەی خۆماڵی رەنگی بنیات نانەکەی نەرێژرابێ، بۆیە ئەم سەرچاوەیە بە سەرچاوەیەکی سەرەکی دادەنێین کە پیرەمێرد وێنەی شیعری لێ بەدەست هێناوە.

---

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/٢١٠.
٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ١/٣٣٥.
٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٢٦٨.



## ب ـ وێنەی ناوچەیی

دیارە مەبەست لە وێنەی ناوچەیی هەموو ئەو وێنانەیە کە لەرۆشنبیری و کەلتووری میللەتانی ناوچەکەوە وەرگیراون و رۆشنبیری و کەلتووری کورد تێکەڵاو بووە لە گەڵیاندا یان ئاشنا بووە پێیان بەتایبەتی میللەتە موسڵمانەکانی ناوچەکە.

سەرەتا ژیانی پیرەمێرد لە ئەستەموڵ بواری ئەوەی بۆ رەخسان کە ئەندێشەی شاعیرانەی کۆمەڵێ وێنە لە شارستانیەت و کەلتووری ئەو سەردەمەی ئەستەمولەوە وەربگرێت، خۆی لەم رووەوە دەڵێ: ((کە ئێواران لە ئەستەمولەوە بە اپۆر ئەگەرامەوە بۆ لانەی سەعادەتی خۆم کە جزیرەی (أطه) بوو، وە سەروەتی فنونم لە گۆگرتەی ئەو واپۆری سەردەریای مەرمەرە دا ئەخوێندەوە تەئسیری ئەو شیعر و ئەدەبیاتە لە ( سندبادی بەحری ) زیاتر ئەیخستمە دەریای خولیاوە ))[1].

جا پیرەمێرد لە دەقێکیدا بە ئەندێشەی شاعیرانەی دەچێتەوە ناو یادگاری ئەو رۆژانەی ئەستەمولەوەو کۆمەڵێ وێنەی جوانی لێ دەهێنێتەوە و دەقی ( شەوێ لە ئەگە ) کەی پێ بنیات دەنێ:

**لە ئەستەمووڵ، لە ( ئەگەی هەگبەلی ) بەبێ دەنگی**
**خزامەبن دەستی جوانان، بەلاپلەر سەنگی**
**لە پێشەوە جووتێکی بالا عەر عەر و لاولاو**
**کە تیشکی کوڵمی ئەوان، مانگی خستبووە ناو ئاو**
**بە یەك دڵی، تەکیاندا بووە یەك بە سەوداوە**
**بەخۆشەویستییەکی روون و پاك و ساواوە**
**بە میهرەبانی ( پەری شۆخ شەو ) کە لە ژوور سەریان**
**بە تیشکی خۆی، جلی زەرکەفتی کردبووە بەریان** [2]

لێرە دا و دەکرێ بوترێ کە وێنەی ( بالا عەر عەر ) و ( بالا لاولاو) وێنەیەکی کلاسیکین، بەلام کە تیشکی (کوڵم) مانگ بخاتە ناو ئاو و مانگیش بۆ خۆی ناوی ( پەری شۆخ شەو ) ی لێ بنرێ ئەمەیان داهێنەرانەیە.

لە دەقی ( جەژنی مەولود و جەژنی نەورۆز ) ەکە شیدا زیرەکانە کۆمەڵێ وێنەی وەرگیراو لە هەردوو کەلتووری خۆماڵی و کەلتووری ناوچەییەوە وەردەگرێت و رەنگی برایەتی کورد و عەرەبیان پێ دەداتەوە:

---

١ـ رۆژنامەی ژین، ژ (٩٦٧) ی ٢/حوزەیرانی/١٩٤٩.
٢ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٢/١٥٧.

**دوو رەبیع، یەکێك مەولوودی سەردار**
**ئەو رەبیعی تر، نەورۆزی بەهار**
**ئەم دوانە ئەمساڵ کەوتوونە مانگێ**
**بۆ پیرۆزی کورد ئاواز و بانگێ**
**نییەتی مەولوود لە نەورۆز دێنین**
**لە گردی یارە مەولوود ئەخوێنین** [١]

لە دەقی ( سەرگورشتە ) کە شیدا بە سوود وەرگرتن لە کەلتوور و رۆشنبیری ناوچەیی کۆمەڵێ وێنەی مەبەستدار بنیات دەنێ بەهۆیانەوە بیرو تێروانینی سیاسیانەی خۆی دەخاتە بەردەست و دەڵێ:

**عیراق کە شوێنی بەنوو عەبباس بوو**
**باخی ئیرەمی لالە عەبباس بوو**
**وەك ( جورجی زەیدان ) نووسیویە بۆمان**
**تا ( بەسرە) بوو بوو بە باخ و بێستان**

— — — — — — — —

**ئەم دیجلەی کەوا پیادەکا گوزەر**
**(هولاکۆ) بەری بەستبوو بەسەر**
**لە دەورەی تورکدا ویلایەتێ بوو**
**لە مانگە رێوە والی بۆ دەچوو**

— — — — — — — —

**توخوا نەنگ نییە لە شەر بترسین ؟**
**لەم رەنگە هەراو گیڤە بپرسین**
**من وام ئەوێ کورد لە پێشەوە بێ**
**وەك فەرهاد بازووی بە تێشە وەبێ** [٢]

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/١٥.
٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/١٨٧.



لە دەقی ( جەژنی پیرۆزە ) کە شیدا و بە هێما کردن بۆ هەردوو شاعیری گەورەی فارس (فیردەوسی) و ( ئەنوەری ) زیرەکانە وێنەی ئەو کە سانە دەخاتە روو کە بەرەو روو دەبنە ستایشکەر و لەپاش ملەش دەبنە زەمکەری:

**ئەمرۆ ( فیردەوسی ) ن لە بەردەمتدا**
**دوایی ( ئەنوەری ) ن لە دوازە متدا**
**بە (ئەحمەد ) ئەڵێن هەر تۆمان ئەوێ**
**شایەری ( وەهبین) بۆ سبەی شەوێ** [١]

لەدەقی ( لەگوێم دێ دەنگی لایلایەی وەتەن ) ەکە شیدا دەڵێ:

**(سەلاحەددین) جەلالی وای نەبوو تەئریخ لەبەرچاوە**
**هەموو پاشای بەبان مردن بە حسرەت رۆژێکی واوە**
**شەوێ دەست ئەهریمەن کەوت خاتەمی مولکی سلێمانی**
**کەچی میرو گزیری پێ ئەکرد قەدری وەها زانی** [٢]

دەبینین زیرەکانە و داهێنەرانە بە هێما کردن بۆ ( سەلاحەددین ) و پاشای بەبان و ئەهریمەن و خاتەمی مولکی سلێمانی کۆمەڵێ وێنەی شیعریی بە هێزو جوانی دارشتووە بەتایبەتیش ( خاتەمی مولکی سلێمانی ) یەکەی کە هێمایە بۆ حەزرەتی (سلێمان) و هەم بۆ شاری سلێمانیش، ئەمە سەرباری وێنەی ئەو باری میر و کزیرکردنە بە خاتەمەکەی مولکی سلێمان کە تا بڵێی وێنەیەکی داهێنراو و نوێیە.

لە دەقی ( کوردی رەوان ) ە کەی ساڵی ( ١٩٣٢) دا دەڵێ:

**بەیانی بوو لەخەو هەستام کە روانیم بەفرە باریوە**
**سلێمانی ئەلیی بەڵقیسە تارای زیوی پۆشیوە**
**دەمێکە چاوەرێی بەفرێکی وا بوم مژدەبێ باری**
**سەرم بەفرە کەچی هێشتا شەرە تۆپەڵمە بۆیاری** [٣]

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٢/٢٠٢.
٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ١/٢٨٤.
٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ١/٣٣٤.

ئەم دەقە لە رووی بنیاتی وێنەی شیعرییەوە کۆمەڵە وێنەیەکی جوانی تیا بنیات نراوە، لە هەندێ وێنەدا سوودی لە کەلتورە ناوچەییەکە وەرگرتووە، لە بەیتی یەکەمدا دەربارەی وێنەی شیعری (بەلْقیس) (د. کامل بەسیر) بەوێنەیەکی سادەی لاسایی کەرەوەی دادەنێ بەو پێیەی ( بەلْقیس ) وێنەیەکی ناوچەیی خواستراوی زۆر دووبارە کراوەیە لە ئەدەبی کلاسیکی ناوچەکەدا [1]، بەڵام وەك دەردەکەوێ پیرەمێرد کارامانە ئەو وێنەیەی بەکۆمەڵێ وێنەی خۆماڵی ئاوێتە کردووە و جوانییەکی کوردەواریانەی پێ بەخشیوە، هەر بۆیە بە یەکێ لە دەقە جوانەکانی پیرەمێرد دا دەنرێ کە سۆزی خۆشەویستی سلێمانی بە تایبەتی و کوردستان بەگشتی لێ دەچۆڕێ.

هەر لەم رووەوە (د. ظاهر لطیف) یش رای وایە کە لێکچواندنی سلێمانی بە(بەلْقیس) لە تێروانینێکی میسالیانەوە سەرچاوەی گرتووە دەیەوێ پێمان بڵێ هیچ نیشتمانێ نییە هێندەی نیشتمانەکەی من جوانبێ [2].

لە شیعری (بەهارمان بۆهات) و لەم بەیتەیدا لێچکواندنی دەنگی بولبول بە ئاوازی خوێندنەوەی (زەبووری داود) کە لە سەرچاوەیەکی ناو چەپیەوە بەدەستی هێناوە وێنەیەکی داهێنراوی جوانی چنیوە:

**وا بولبول بەسەر گوڵدا ئەخوێنێ**

**نەغمەی (زەبووری داود) ئەنوێنێ**[3]

## ج ــ وێنەی جیهانی

گومانی تیا نییە کە شەیدا بوونی پیرەمێرد بە جیهانی پێشکەوتووی ئەورووپاوە کە بەهۆی ژیانی ئەستەمولێیەوە ئاشنایەتی لە گەڵیدا پەیدا کرد بوو، بوو بە هۆی ئەوەی لە زۆر دەقیدا سوود لە وێنەو دیمەنە شارستانییەتە نوێیانە وەرگرێ کە رەنگ پێدەرەوەی ژیانی نوێی پێشکەوتوون، ئەمە سەرباری ئەو وێنانەی کە لە کارەسات و رووداوەکانی ئەو سەردەمەی جیهانەوە بەدەست هێنراون.

لە دەقی ( لەگوێ شەتی بەغدا ) کەیدا ئەندێشەی داهێنەرانەی کۆمەڵێ وێنەی شارستانییەتی ئەوروپا دەهێنێت و نەخشەی داهاتووی شاری سلێمانی دەکێشێ و دەڵێ:

ـــــــــــــــــــ

١ـ بروانە: د. کامل حسن عزیز البصیر، رەخنە سازی ــ مێژوو پیرەوی کردن، بەغدا، چاپخانەی کۆری زانیاری عیراق، ١٩٨٣، ل١٦٢.

٢ـ بروانە: د. ظاهر لطیف کریم، مرجعیة النص ــ دراسة نقدیة تحلیلیة، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ ( الملحق العربی )، العدد (٧)، کانون الثانی ٢٠٠٤، ص٥.

٣ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/٣٢٧.



**ئەلەکتریك لە بەرانانەوە هەتا گۆیژە**

**تەلی بەسەر هەموو شارا کشاوە بەبێ پەیژە**

**لەراستی تەختی سلێمانی پێنج ئەوەندەی مانگ**

**گلۆپی نوور، دەروو ژوور، روون ئەکاتەوە تابانگ**

**تەرەسوداتی تەلەسکۆبی سەر عومەرگودروون**

**لە پێش قوللەی (ئیڤلا) بۆی لواوە کەشفی شۆون**

**لە سەرچنارەوە تا تانجەرۆ لە ریزی چەم**

**بوخاری ماکینە رووی ئاسمانی کردووە بەتەم** [1]

هەر لەپاڵ ئەم دیمەنە نوێیانەی شارستانیەتدا کە پیرەمێرد دەیویست بیان گوێزێتەوە بۆ کوردستان تا سیمای پێشکەوتنی پێ ببەخشن، بەرەنگاری ئەو دیمەن و دیاردە خراپانەش بۆتەوە کە سەرچاوەکەیان ژیانی شارستانیەتی نوێ بووە بە تایبەتی ئەو دیاردانەی کە کەلتووری کوردەواریان پێ دەشێوێنرێ بۆیە دەڵێ:

**لە شوێن سەر مەلاو (الله أكبر)**

**(کاری) کار ئەکاو (ستریت و جۆکەر )** [2]

هەر لەم رووەوە و لە هەمان روانگەی خەمی پارێزگاری کردن لە کەلتوری کوردەواری دەڵێ:

**سەر لە ژێر سیدارە نانێم، کوردم و تەپلەم بەسە**

**جوق و بووقم بۆ چییە ؟ گۆرانی و چەپڵەم بەسە** [3]

هەروەها بە هیما کردن بۆ (ریچارد) ی پاشای ئینگلیز لە شەری خاچ پەرستەکاندا و ئەو رووداوەی کە لەنێوان ئەو و (سەلاحەددین ئەیوبی) دا روویدا وێنەیەکی شیعری جوانی ئاودارو بەهەست و سۆزو بیری نەتەوایەتی دەهێنێتەوە و دەڵێ:

**قەسەم بەو عەزمی کوردەی شانی (ریچارد ) ی بەشیر رووشان**

**کڵاوی کورد ئەبێ قووچ بێ کە هاتوو شانی خۆی جووڵان** [4]

ـــــــــــــــــــ

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی،دیوانی پیرەمێرد: ٢/١٦٠.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٥٥.

٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/١٢٩.

٤ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٢٨٥.

له دەقی ( ورێنەی مەستی ) یشدا بە تێروانینێکی فەلسەفیانە هێما بۆ حەزرەتی (ئادەم) دەکات و دەڵێ:

**باری گوناهم ئەگەر لەملە**
**بناوانەکەی باوکم وا شلە** (1)

ڕۆژانی جەنگی دووەمی جیهانیش کۆمەڵێ وێنەی خستە بەردەستی پیرەمێرد تاچەند دەقێکی شیعرییان پێ بنیات بنێ و بیرو تێروانینی کوردانەو سیاسیانەی خۆشی پێ دەربریوە، وەك لە شیعری (نەورۆز و مەولود ) ە کەیدا دەڵێ:

**ئاگری نەورۆزمان لە (هیتلەر) بەردا**
**خۆڵی مردوومان بێژا بەسەردا**
**کە خۆڵی مردووی کرا بەسەردا**
**دەستی لە یەخەی شەڕو گەر بەردا**
**کە هیتلەر نەما غوولی یابانی**
**زۆری نامێنێ بۆ ملشکانی** (2)

دیارە لێرەدا بەسوود وەرگرتن لە دیاردەکانی شەری دووەم توانیویەتی کۆمەڵێ وێنەی جیهانی پێ بنیات بنێ دژی هیتلەرو نازیەت و ئیبراتوریەتی یابانی ئەو سەردەمە.

له دەقی (سەلای سەلاح ) ە کەشیدا دەڵێ:

**لەو شەوەی بەختی (میحوەر) وەرگەرا**
**نووزەی نازیەکان لە لیبیا برا**
**ڕۆژی (ڕۆمیل) یش بوو بەشەو، شکا**
**ئابرووی (فاشیست) ی ئێجگاری تکا**
**ئەمریکا هات جەزلئیر گرت**
**ئەمیرال (درلان) کەوتە جرتوفرت** (3)

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/٢٢.
٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٧٨.
٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٥٠.



هەر چۆنێ بێ ئەم تێروانینانەی پیرەمێرد بۆ شەری دووەم نیشاندنی هەڵوێستی دژایەتی کردنێکی توندە دژی فاشست و نازیەت چ بە نووسین یا بە شیعر بووبێت کە کۆمەڵێ وێنەی شیعریی جیهانی تیا ئەنجام دراون، کە ئەمەش نموونەیەکی تری بنیاتی ئەو وێنە شیعریانەن:

**سیاسی نیم و عەسکەر نیم، بەڵام دیارە بە ئاساری**
**کە هیتلەر لەڕ بووە، نەیماوە هەڵپەی پاروپیڕاری**
**لە (بەڕ) کەڵبەو بڕەی وردکردووە ( ورچێکی ) کوێستانی**
**لە ئاویشا بە جارێ دوو (نەهەنگ) داویە پەلاماری**
**ڕەفیقیشی کە (مۆسولینی) یە مەعلوومە لای عالەم**
**لە دەست یونان، گەیشتە ئاسمان، فریاد و هاواری** (1)

دیارە لێرەدا ئەم وێنانە وێنەی جیهانین و زیاتر ئەرکی سیاسیان پێ بینراوە، بە زمانێکی سادەو ساکار کە بۆ مەبەستەکەی بشێن بنیات نراوە، بۆیە ئەگەر داهێنراویش نەبن ئەوا هەر بۆ خۆیان ئەو ئەرکەیان بینیوە کە پیرەمێرد مەبەستی بووە لەو ڕۆژانەدا.

بەم ڕەنگە دەتوانین بڵێین بەشێك لە سیمای شیعریەتی دەقەکانی پیرەمێرد لەلایەك و شەقلی ڕەسەنی دەقەکانی بەو وێنە شیعرییانە بنیات نراون کە لەو سێ سەرچاوەیەوە بەدەستی هێناون بە تایبەتی سەرچاوە خۆماڵییەکە کە کەم شاعیر هێندەی پیرەمێرد رووی تێکردووە و سوودی لێ بینیوە.

## ٣ ــ ئاوازی شیعری لەدەقە شیعرییەکانی پیرەمێرد دا

بۆ لێکۆڵینەوە لە بنیاتی ئاوازەیی دەقەکانی پیرەمێرد سەرەتا روو لە بنیاتی ئاوازەیی دەرەوەی دەقەکان دەکەین کە کێش و قافیە پێکیان دەهێنن و پاشتر باس لە ئاوازی ناوەوەی دەقەکان دەکەین.

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی،دیوانی پیرەمێرد: ٢/٢٩٩.

## أ ـــ ئاوازی دەرەوەی دەقەکان

### ١ ـــ کێشی دەقەکان

دەربارەی رووکردنە کێشی بڕگەیی لەلایەن (گۆران) ەوە کەوا لەو بەرهەمانەی کە لەرۆژنامەی (ژیان) دا بلاویکردونەتەوە و (( بریتی بوون لە ( شەوێکی بەهار، سەوزە گیای پایز ) لەمانگی ئابی ١٩٣١ داو ( ئەی نەی، سکالا، شیوەنی گولالە، دەروێش عەبدوللا، گوڵی کەم خایەن، بۆ رۆحی سالم ) لە ماوەی ٢٨/٤/١٩٣٢ تا ٢٤/١١/١٩٣٢ تەنها ( سەوزە گیای پایز) ەکەی لەسەر کێشی بڕگەیی یە ئیتر ئەوانی تر هەموویان لەسەر کێشی عەروزین ..... هەرچی ( ئاواتی دووری ) و ( ئلهامی هاوار ) و ( ئەی گەلاوێژ )ن کە لە هەمان سالدا لە گۆڤاری (هاوار) دا بلاوکراونەتەوە، ئەوا لە یەکەمیاندا هەر دووکێشی عەرووزی و بڕگەییەکەی ئاوێتە کردووە و دووەم کە ئەگەرچی کێشەکەی بڕگەیی یە بەلام دیارە کە وەك بابەت تایبەتە بە گۆڤاری هاوار و نەوەی بەدرخانییەکانەوە سێیەمیشیان لەسەر کێشی عەروزییە )) [1].

کەواتە لەناو هەموو ئەو دەقە بلاوکراوانەی (گۆران) لەسەرەتای تەمەنە شیعرییەکەیدا و لە سالانی (١٩٣١ـــ١٩٣٢) داو بریتین لە (١٢) دەقی شیعری، (٢) دەقیان لەسەر کێشی بڕگەیین و دەقێکیان کێشی عەروزی و بڕگەیی تیادا ئاوێتەکردووە، ئیتر ئەوانی تر عەروزین، واتە لەسەرەتای سییەکاندا گۆران رووی لە کێشی بڕگەیی کردووە ئەویش زۆر بەکەمی.

هەرچی پیرەمێردە ئەوا لەو دەقانەیدا کە لەنێوان سالی (١٩٠٨ـــ١٩٣٠) دایە کۆمەڵێ دەقی لەسەر کێشی بڕگەیی بلاوکردۆتەوە لەوانە ( مستۆ وادیارە، عابیدێ کونجی مزگەوتێکی گرت، لغاوی شەیتان (مام چەوەندەری زیرینوکی )، بالۆرەی نەسرین، وەفدی کوردستان)، واتە پێش گۆرانو شاعیرانی تر رووی لە کێشی بڕگەیی کردووە و بەمەش بووە رێچکە شکێن و رێچکەکەرەوە بۆ شیعری کرمانجی خواروو لەرووی بەکارهێنانی کێشی بڕگەییەوە. لە دەقی ( مستۆ وا دیارە ) کەیدا کێشە (دە) بڕگە یە باوەکەی شیعری گۆرانی (هەورامی) بەکارهێناوە، بە دەستە پێی (٥+٥)، ئەوەشی تێبینی دەکرێ ئەوەیە کە خوێندنەوەکە سنووری بڕگەکان دیاری دەکات، واتە وەك لەم بەیتەیدا تێبینی دەکەین:

١ـ د. دلشاد عەلی، گۆران داهێنان و نوێخوازی، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، ژ (٢٠) ی حوزەیرانی ٢٠٠٧، ل٥٢ـــ٥٣.



**مستۆ وا دیارە تۆش جل خوار ئەکەی**

**ئەستۆت ئە خورێ و مەیلی بار ئەکەی** [1]

لە دیوانەکەیدا دێری یەکەمی بەم شێوەیە خالبەندی بۆکراوە:

( مستۆ وا دیارە، تۆش جل، خوار، ئەکەی ) کە بێگومان ئەو چەشنە خالبەندییە بەهەلە دیاری کراوە بەوپێیەی خوێندنەوەی بەیتەکە بەم شێوەیە بڕگەکان دیاری دەکات:

مس/تۆ/وا/دیا/رە/تۆش/جل/خوا/رە/کەی

ئەس/تۆ/تە/خو/رێ و/ مەی/لی/با/رە/کەی

مستۆ وا دیارە / تۆش جل خوارەکەی

٥ + ٥

ئەستۆت ئەخورێ و / مەیلی بارەکەی

٥ + ٥

دەقی ( لغاوی شەیتان ) ەکەی هەشت بڕگەیی یە، دەستە پێ کانیشی بریتین لە ( ٣ + ٥)، (٤ + ٤ ) لەگەڵ ئەو تێبینیەی کە هەندێ نیوە دێری بەیتەکان (نۆ) بڕگەیین:

**مام چەوەندەری زیرینۆکێ          پیرەمێردێ بوو ئەکۆکێ**

**شێفی ئەبری لەوێڵەدەر          بەردێکی زلی هاتە بەر**

**نووکی گاسنەکەی تێگیراند          بەردەکەی لە جێی خۆی جولاند** [2]

لە ( بالۆرەی نەسرین ) ەکە شیدا کێشی (حەوت) بڕگەیی بەدەستە پێی (٣ + ٤) و (٤ + ٣) و ( ٢ + ٥) و (٥ + ٢) بەکارهێناوە:

**نەسرین گوڵی نەسرینە          چوزەرەی یاسەمینە**

**خنجیلە و خوێنشیرینە          دەمی بە پێکەنینە**

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٢/٣١٠.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٣٠١.

## ٣ــــ شیعری کۆمەڵایەتی

شـیعری کۆمەڵایــەتی جـۆرێکی تـری بابــەتی شـیعرە کــە راسـتەوخۆ پێوەنـدە بــە ژیــانی کۆمەڵایەتییەوە و دەکەوێتە ژێر کارێگەرییەوە و بۆ خۆی دەبێتە ئەڵقەیەکی بەیەکەوە بەستراوی نیــوان شاعیرو کۆمەڵەکەی [1]. لە راستی دا ئەم پێکەوە گرێ دان و پێوەندییە مەرج نییە لە ئەدەبی هەموو نەتەوەیەکدا چوون یەك بێت بەڵکو بەپێ ی سەردەم و چەمکی شیعرو شـێوازی مامەڵــەکردنی شـاعیر لەگەڵ هونەرەکەیدا بەردەوام سیمای جیاواز وەردەگرێت.

بەلای ( د. شوکریە رەسوڵ ) ەوە شیعری کۆمەڵایەتی (( ئەو شیعرەیە کە گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و دەردەکانی کۆمەڵ لە هەژاری و نەزانین و نە خوێندەواری و نەخۆشــی و لایەنــە چــەوتەکانی کۆمــەڵ دەخاتە روو، لەهەمان کاتیشدا شاعیر هەوڵ دەدات چارەسەری ئەو دەردە کۆمەڵایەتییانــە بکـات کــە لەناو کۆمەڵدا باون )) [2].

لەرووی مێژووییەوە ئەگەر بروانینە مێژووی ئەدەبی کوردی دەگەینە ئەو راستییەی کە((لەگەڵ ئــەوەی قوتابخانەی کلاسیکیمان سەرتاپای ئەو بەرگەی نەپۆشیوە، بەڵام زۆر بەرهەمی شیعری راستگۆیانە ئاوێتەی کێشەو رووداوەکانی سەردەمەکەی دەبێت و لە بۆتەی ئەوانیشدا لە دایك دەبێت))[3].

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمــدا تــۆوی ســەرهەڵدانی ئــەم جــۆرەی شــیعر لای شــاعیرانی کرمانجی خواروو بەدی دەکرێ بەتایبەتی لای نــالی و ســالم و مــەحوی[4]، بــەڵام دواتــر ئەگــەر بــەرەو سەرووتر هەنگاو بنێین (( ئەوا بە دڵنیاییەوە دەتوانین ئەوە دەست نیشان بکــەین کــە شــیعری کــوردی

١ـ عربیە توفیق لازم، حرکة التطور والتجدید فی الشعر العراقی الحدیث، بغداد، مطبعة الزمان، ١٩٨٦، ص١٧٤.

٢ـ ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب: ل٨٢.

٣ـ دڵشاد عەلی، سلێمانی لەروانگەی شیعرەوە، گۆڤاری رۆشنبری نوێ، ژ(١١٢) ی کانونی دووەمی ١٩٨٦، ل٥٩.

٤ـ نالی شاعیر لەسەردەمی خۆیدا رەخنەی لە شێخ و مەلا و زاهد و سوفی گرتووە وەك لەم بەیتەیدا

دەڵێ: بنوارە وشکە سۆفی و رەقسی بەهەڵهەلە

دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێ مەلە

بروانە: دیوانی نالی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس، بەغدا، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، ١٩٧٦، ل٤٦٦.



هەر لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە چالاکانە دەوری کاریگەری لە بنیــاتی کۆمەڵایەتیــدا بینیوە و کراوە بە چەکێك و بەرەنگاری دیاردە دواکەوتووەکانی پێکراوەتەوە )) [1]، دەکرێ ئەمەش بە ئاشکرا لە شیعرەکانی ( حاجی قادری کۆیی ) دا بەدی بکرێ بەرادەیەك کە بەســەرەتای گەشــەکردنی شیعری کۆمەڵایەتی دابنرێ بەو پێیەی کە توانیویــەتی جۆرێــك لــە ژیــانی کۆمەڵایــەتی کۆمــەڵگای کوردەواری ئەوسەردەمەمان نیشان بدات.

لەگەڵ چوونە ناو رۆژانی ســەدەی بیســتەمەوە دەبیــنین کۆمەڵگــەی کــوردەواری لــەباروودۆخێکی ناهەموارو رۆژگارێکی سەختی دواکەوتو دا دەژیاو، ئالەم باروودۆخــەدا ئــەدەب بەگــشتی و شــیعر بــە تایبەتی ئەرکێکی تری کەوتە بــەردەم ئــەویش ئــەرکی چاکسازی کۆمەڵایــەتی و وشــیار کردنــەوەی جەماوەر بو لەو گیروگرفتانەی کە کۆمەڵگا بە دەستیەوە دەیناڵاند [2].

جا هەر لەم روانگەی تێروانینەمان بۆبابەتی شـیعری کۆمەڵایــەتی و ئــەرکی ئــەم جــۆری شـیعر روو لــە بەرهەمە شیعرییەکانی پیرەمێرد دەکەین، بەڵام پێش ئەوەی روو لەو بوارە کۆمەڵایەتیانە بکەین کە شیعرەکانی پیرەمێرد رووی تێکردون دەبێ ئەو راستییە فەرامۆش نەکرێ کە کەسێتی پیرەمێرد وەك مرۆڤێکی رووناکبیری پەروەردە بووی ناو شارستانیەتێکی پێشکەوتوو بە بەراورد لەگەڵ کوردستانێکی دواکەوتووی ژێر باری هــەموو دیاردە دواکەوتووە کۆمەڵایەتییەکاندا راستەوخۆ لەگەڵ گەرانەوەیدا بکەوێتە ململانێیەکی سەختەوە لەگەڵ ئەو دیاردە کۆمەڵایەتییە دواکەوتوانەدا، بەتایبــەتیش بیروبــاوەرە نەتەوەییەکــەی پیرەمێــرد وای لێ کــرد کــەوەك خێزانێك لەکۆمەڵگەی کوردەواری بروانێ و مامەڵەی کا، خێزانێك کە کــەموکوری لەهــەر ئەندامێکیــدا کــار دەکاتە سەر ئەندامەکانی تری، هەر بۆیە دەیویست کۆمەڵگــەی کــوردەواری وەك خێزانێکــی مــۆدێرن بنیــات بنێتەوە، بۆیە (عەلادین سەجادی) یش دەڵێ: (( خزمەتێکی تری پیرەمێرد کۆششی مەردانەی بوو بۆ گــۆرینی ژیانی خێزانی ونزیك خستنەوەیان بووە لە ژیانی شارستانی تازە ))[3]، بــۆ بــەدیهێنانی ئــەو ئامانجــەش رووی لەکۆمەڵێ بواری کۆمەڵایەتی کردووە، بەدەقە شیعرییەکانی بەگشتی و بە پەندە شیعرییەکانی بەتایبەتی تۆوی

١ـ محمد فاضل مصطفی، زێوەر ژیان و بەرهەمی (نامەی ماستەر): ل٨٢.

٢ـ بروانە: صالح حسین الجمیلی، شعر حافظ جمیل ـ دراسة نقدیة ( اطروحة ماجیستر )، جامعە الموصل، کلیە الاداب، ١٩٨٧، ص١١١.

٣ـ یادی پیرەمێرد: ل٢٣.

چاكسازی كۆمەڵایەتی بەناو گەلەكەیدا بڵاوكردۆتەوەو دەكرێ لێرەدا بەجیا باس لەو بوارە كۆمەڵایەتیانە بكەین كە پیرەمێرد وەك دەنگێكی شیعری روی تێكردون:

### أـ بواری خوێندەواری

دیارە پیرەمێرد كەروی لەكوردستان كردەوە بەو ئومێدەوە هاتەوە كە تیشكە رووناكەكانی شارستانیەت شەوی تاریكی سەدان ساڵەی كوردستان برەوێننەوەو لە دواكەو تویی رزگاریان بێت، ئەم ئاواتانەشی جوانكاریانە كردۆتە هەوێنی یەكێ لە دەقە شیعرییەكانی كە تیایدا دەڵێ:

**شەوێ لە گوێ شەتی بەغدا خەیاڵی كوردم ئەكرد**
**گەلێ لەگەل بەجێمابووم و دەستوبردم ئەكرد**
**بەباڵی شیعرو خەیاڵ، كەوتمە پەلەو تەكوتاز**
**لە ئاسمانی سەرفرازی هاتمە پەرواز**

— — — — — — — — — —

**ئەلەكتریك لە بەرانانەوە هەتا گۆیژە**
**تەلی بەسەر هەموو شاراكشاوە بەبێ پەیژە**
**لەراستی تەختی سلێمانی پێنج ئەوەندەی مانگ**
**گلۆپی نوور، دەروژوور، روون ئەكاتەوە تابانگ**
**تەرەسوداتی تەلەسكوبی سەر عومەر گەر دوون**
**لەپێش قوللەی (ئیڤلا) بۆی لواوە كەشفی شئوون**

— — — — — — — — — —

**تونێل لە گۆیژە و تاریدەرا وەكو تۆرووس**
**خەتی شەمەندەفەری پێگەیشتە رووس**
**دەماری مەعدەنی ئاڵتونی شاری عەوالان**
**تیجارەتی هەموو دنیا دەكێشێ وەك تالان** [1]

ـــــــــــــــ

١ـ فایەق هوشیار و هاورێكانی، دیوانی پرەمێرد: ٢/١٥٩.



دیارە هەر زوو دەركی بەوەكرد بوو كە بناغەی ئەو رۆژە گەش و پێشكەوتووانە بە خوێندەواری دادەرێژرێ، هەر بۆیە یەكەم بواری چاكسازی كۆمەڵایەتی كەرووی تێكرد بـواری خوێنـدەواری بـووە و پێش ئەوەشی كە ماڵئاوایی لە نەتەوەكەی بكا ئەوەی دەهێنایەوە یاد كە خوێندەواری ئەو چرایەیە كە رێگای ژیانیان بەردەوام بۆ رۆشن كاتەوە، ئەوەتا لەسەرەتای هاتنەوەیدا گوێمان لێ دەبێ كە دەڵێ:

**سەبا دێنێتە گوێم دەنگی منالانی قوتابخانە**
**نەشیدی میللی یان لاهووتی یە قووتی دڵ و گیانە**
**ئومیدم وایە ئەم دەستەكورانە مەشخەڵی هەڵكەن**
**لەتاریكی نەزانی دا، بەزانستی وەتەن دەركەن** [1]

لە وەسێتنامەكە شیدا روو لەگەلەكەی دەكات و دەڵێ:

**لای من بە خوێندەواری یە ئاە خوێندەواری یە**
**هەر میللەتێ كە فەنی نەبێ دەردی كاری یە**
**ئاخ خۆزگە خوێندنیش وەكوو من ئارەزوو ئەكەم**
**ببیـنم و نـەبێتە گـرێی قـورسی كفنەكـەم** [2]

دیارە پێش هاتنەوەی پیرەمێرد رۆشنبیران و مامۆستایانی كورد بەكردنەوەی قوتابخانە رێچكەی هەڵتەكاندنی نەزانینیان كردبۆوە، هەر بۆیە لە ڕوانگەی پـەیڕەوی ئـەو واتایـەی ڕۆژنامـە نووسـێكی گـەورە كـە وتویـەتی ( كـە بینـیم خـەڵكی منالّیـان نانێرنـە قوتابخانـە، مـن قوتابخانـەم نـاردە ماڵەكانیانەوە)[3]، ئا بەم تێروانینەوە ئەمیش راستەوخۆ چووە ناو بازنەی ئەو ئەركەوە ئەویش بـەوەی بـووە ئەنـدامێكی چـالاك و دیـاری ( كۆمـەڵی زانـستی كـوردان )، هـەر لـە ئـابی سـاڵی (١٩٢٦)ەوە((بەمێشك و بازووی بەتوانای بـێ سـنووری جێگـای تایبـەتی و پایـەی سروشـتی خـۆی وەرگرت وە بە مەردانە كاروباری بنەرەتی كۆمـەڵی خـستە ئەسـتۆی وەبـە هـەموو هێزییـەوە خـۆی هاویشتە دەریای بێ بنی كاری كۆمەڵەوە )) [4]. دیارە رۆڵی قوتابخانەی زانستی بەگشتی و چالاكییە

ـــــــــــــــ

١ـ فایەق هوشیار و هاورێكانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/٢٣٩.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ١/٥٧.

٣ـ بروانە: مستەفا سالح كەریم، باخێك لەوشە، سلێمانی، چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٦، ل١٥٤.

٤ـ غەفور میرزا كەریم، كۆمەڵەی زانستی كوردان، بغداد، چاپخانەی جاحظ، ١٩٨٥، ل٤٠.

رۆشــنبیرییەکانی پیرەمێــرد لــەو قوتابخانەیــەدا بــۆ خۆیــان چــەپکێ تیــشکی روونــاکن لەمێــژووی خوێندەواریو رۆشنبیری کۆمەڵگای کورددا، هەر بۆیە (گۆران) ی شاعیر دەربارەی پیرەمێرد دەڵــێ: (( ئەی رەنج و تێکۆشانی چەند ساڵەی قوتابخانەی زانستی چی کە بەگەواهی هەموو تێگەیشتویەك یەکەم قوتابخانەی (ئەهلی) بوو لەهەموو کوردستانا )) [١].

بێگومان هەر ئەو بەهاو بایەخەی خوێندەواری لەلای پیرەمێرد لەلایەك و چالاکییەکانیشی لەو بوارەدا لەلایەکی ترەوە بوونەتە هەوێنی دەیان دەقی شیعری لەم بوارەدا کەبە هەموویان ئەو راستییە دەخەنە بەردەست کە لەم بوارەی شیعری کۆمەڵایەتیدا پیرەمێرد یەکێ بووە لە دەنگە شیعرییە هەرە دیارەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە ئەدەبی کوردیدا و وەك دەنگێکی جەماوەری کار دانەوەی دیاری لەسەر هەنگاو پێ هەڵهێنانی کوڕان و کچان و باوکان و دایکانی گەلەکەی بووە بەرەو خوێندن:

**هەرچی هەواڵی دنیا تێدەگا**
**ئەڵێ: بەخوێندن قەومێ پێدەگا**
**بەڵێ ئینکاری خوێندن ناکرێ**
**بۆ هەمووشتێ خوێندن کەڵك ئەگرێ** [٢]

## ب ـ کێشەی ژنان

وەك ئاشکرایە لەو ساڵانەدا کە پیرەمێرد هاتەوە کوردستان ژنانی کۆمەڵگاکەی کوردەواری چەوساوەیەکی دیاری ناو خێزان و ناو کۆمەڵگا بوون و لە زۆربەی هەرە زۆری مافەکانیان وەك مرۆڤ بێ بەش کرا بوون، هەر بۆیە پیرەمێردیش زیرەکانە و وشیارانە رووی تێکردن و بە ئومێدی سەرفراز کردنیان کۆمەڵێ لەبەرهەمەکانی بۆتەرخان کردون و (( لە زۆر شوێن وکاتدا لەسەریان هەڵی داوەو خۆی توشی قسەوقسە لۆك کردووە... ئەمەش ئەوە دەسەڵمێنێ کە پیرەمێرد نەك هەر بەئەدەب، بەکردەوەش لە سەر ژنی کوردی کردۆتەوە )) [٣]، یەکەم کێشەش کە پیرەمێرد رووی تێکرد کێشەی بێ بەش کردنی ئافرەتان بوو لە خوێندن، هەر بۆیە ئەمیش

١ـ یادی پیرەمێرد: ل٨١.
٢ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پرەمێرد: ٢/٢١٠.
٣ـ کاکە مەم بۆتانی، باسێکی کورتی ئافرەت لە هەڵبەستەکانی پیرەمێرد دا، گۆڤاری باسکار، ژ (٦) ی ساڵی ٢٠٠١، ل٩٩.



بەدەقە شیعرییەکانی هەوڵیدا تا لەلایەك مافی خوێندنیان پێ بدرێ لەلایەکی ترەوە ژنان خۆشیان وشیار کاتەوە بەوەی کە بە چەکی خوێندەواری دەتوانن شوێن پێی خۆیان لەناو خێزان و کۆمەڵگاکە یاندا بکەنەوە و بەرگی دواکەوتوویی لە خۆیان داماڵێنن:

**ئەی کچینە وەرنە مەکتەب ئێوە تەسکینی دڵن**
**زینەتی باغ و تەرەقین رەونەقی دەستەی گوڵن**
**تازە ئێمە تێگەیشتووین دایکی چاکی خوێندەوار**
**نەسلی وا دێنێتە مەیدان قەومەکەی پێ بێتەکار**

— — — — — — — — — — —

**هەرکچانی خوێندەوارە میللەتی پێ سەرکەوێ**
**تەربیەی منداڵ هیوایە پێشرەویمان بەرکەوێ**
**رۆژهەڵاتیش رۆژی هەڵدێ خوێندنی کچ هاتەناو**
**جەهلە تاریکە شەوی کورد خوێندنیش تیشکی هەتاو** [١]

دیارە چوونە ناو کێشەکانی ژنانەوە بۆ پیرەمێردێکی نیشتمان پەروەر بۆ خۆی ئاکامی دەرك کردنی بووە بەو راستیەی کە میللەتێ ژنانی چەوساوەو بەش خوراو بن، لە شارستانییەت و ئاسۆی سەرفرازیش بێبەش دەبن بۆیە دەڵێ: (( من هەمیشە هیواداری تەبەقەی کچان و ژنانی خوێندەوارم بەتەربیەی عیلم و فەن ئەولادی وا پێبگەیەنن کە خزمەتی قەوم و نیشتمان بکەن و قەومەکەی خۆیان سەربخەن )) [٢]، وە نەبێ ئەم ئەرکەی کە لێرەدا پیرەمێرد بۆ ژنانی خوێندەواری دیاری کردووە کە پێگەیاندنی منداڵ بێ بۆ خۆی تاکە ئەرك بێ، بەڵکو لەو بروایەدا بووە کە ژنان نەك هەر لە پیاوان کەمترنین بەڵکو ئەگەر بواریان بۆ برەخسێ لەوانیش بەتوانا ترن بۆیە لەوتارێکیدا بەناونیشانی ( من و تەرفداری ئافرەت ) دا دەڵێ: (( ساڵە های ساڵە ئێمە ئەڵێین ئەگەر جنسی لەتیف لە دەرەجەی پیاواندا بناسرێن و خوێندن و کۆششیان ببێ، لە پیاو دواناکەون، زۆر ژنی وا هەیە کە لەپیاوەتی و رەویەی بزرگی و دەستگیری بێ چارەکان و ئیدارەی میوان و دیوەخان و فکری ئیجتماعی وسیاسی و ئیداری دا پیاوان و پیاوانیان هێشویان لە پشتەوە ناکەن ))[٣]، دیارە لەناو هەموو ئەوکێشانەی ئافرەتی تیا دەژیا و تیایاندا بەش خوراو دەبوو کێشەیەکی وەك بەزۆر

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/٢٦٣.
٢ـ ئومێد ئاشنا، پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی: ١/٢٧.
٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ١/٢٧.

بەشوودان بۆ خۆی ببوە دیاردەیەکی هێندە ناهەمواری کۆمەڵایەتی کە هەموو ژنانی کوردی گرتبۆوە، بۆیە پیرەمێردیش لە ( مەم و زین ) ەکەیدا ئاور لەم دیاردەیە دەداتەوە و زیرەکانە هێمای بۆ دەکات، هەروەك ( رەفیق حیلمی ) دەڵێ: (( هەر لەم لاوانەوەیەدا پیرەمێرد دوای مەبەستێکی تری کۆمەڵایەتی کەوتووە، تانووتێکی لە چەشنی کچ بەشوودانی ولاتی خۆی گرتووە و ویستویەتی لەم کارە گەورەیەدا کە بناغەی ژینێکی تازەی پێ دائەمەزرێ هیچ نەبێ نرخێکی زۆربچوك بە کچ بدرێت و بیرو دڵخوازی ئەویش تاقی بکرێتەوە )) [١]، هەروەك دەڵێ:

**ئاخ بۆ دەنگ خۆشێ لەژوور سەرینمان**
**بەپیتی کوردی بدا تەلقینمان**
**بلێ ئاخ دڵی دڵخواز مەشکێنن**
**بەزۆرە ملی کچان مەمرێنن** [٢]

هەر ئەم تێروانینانەی لەلایەك دەقە شیعرییەکانی لەلایەکی ترەوە ئەو راستییەیان خستۆتە بەر دەست ( رەفیق حیلمی ) کە پیرەمێرد (( زۆر هەوڵی ئەوەی داوە کە ئینقلابێك بخاتە ژینی عائیلەوە، لەبەر ئەمەش زۆر لەژنان نزیك بۆتەوە بەتەعبیری خۆی فیمینیزمە ))[٣]

هەر ئەم هیواو ئاواتەی پیرەمێرد بەو رۆژەی کە ژنان شان بەشانی پیاو رۆڵی خۆیان لە کۆمەڵەکەیاندا دەبینن بەتایبەتی لە بواری تێکۆشاندا لەدوا ساڵەکانی ژیانیدا هاتەدی کاتێ بینی سنگی کچان لەپاڵ کوراندا بۆتە قەڵغانی گولەی دوژمنان و داگیرکەران.

## ج ــ نەریتە کۆمەڵایەتییەکان

وەك ئاشکرایە بوارێك لەو بوارە کۆمەڵایەتیانەی کە پیرەمێرد رووی تێکرد ئەو خوو نەریت و رەوشتە دواکەوتوانەی کۆمەڵ بوون کە بەری پێشکەوتنیان لە کۆمەڵگا دەکرت، هەر لە پاڵ ئەو نەریتە دواکەوتوانەشدا ئەوراستییەشی خستۆتە بەردەست کە هەندێ دیاردەی شارستانی نامۆ بە گەلەکەی دیسان نەك هەر بەها پیرۆزەکانی کۆمەڵگا دەشێوێنن بەڵکو پێوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیش تێك دەدەن، هەر لەسەرەتاوە هەڵوێستی خۆی بەرامبەر کۆمەڵێ دیاردەی بێزاو دەخاتە روو دەڵێ:

١ـ رەفیق حیلمی، شیعرو ئەدەبیات کوردی: ١/٨٧.
٢ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/٨٩.
٣ـ رەفیق حیلمی، شیعرو ئەدەبیاتی کوردی: ١/٨٢.



**دەشتم هێندە لاگرانە راستی پێ ی سەختم تەواو**
**نازی عاشق، نوێژی فاسق، کیبرو خۆ بادانی پیاو**
**دەردی بەرتیل، رووی بەخیل، گاڵتەی رەزیل، ئەرکی دەلیل**
**دەنگی ناسازی موئەزین، برسێتی و هەوراز بەدیل**
**دەردی سەری ئەم نۆیە دەردی سەری یە بۆ ئەم عالەمە** [١]

کاتێکیش دەبینێ نەریتی لێدانی منداڵ لە حوجرەکاندا گوێزاوەتەوە بۆ ناو قوتابخانەکانیش دەڵێ:

**مامۆستا بەدار لەقوتابی دا**
**چوەلای باوکی بە سەریا گریا**
**وتی: مامۆستا بەدار لێم ئەدا**
**وتی: لە بەهەشت دار هاتە دونیا**
**وتی ئەگەر دار چاك دەبوو ئەوسا**
**لە بەهەشتا بۆچ ئەهاتە دونیا** [٢]

لەدەقی دەردی کۆمەڵایەتییەکەیدا بە وردی وێنەی ئەو دیاردە دزێوانەمان نیشان دەدات کە بە سەرزاری دیمەنی رابواردن و خۆشگوزەرانین، بەڵام بۆ گەلێك کە هێشتا لەژێر باڵی دواکەوتویدا ئەناڵێنن ئەو دیاردانە دەبنە مایەی سستکردن نەك خۆشی بەخشین و دەڵێ:

**تیاترۆی ئێرە و گشت ئینتزامی**
**ئێستا هاتۆتە سەرگەمەی رامی**
**بلاو بۆتەوە لەناو خاس و عام**
**جۆکەریان کردە ویردی سوبح و شام**
**گەر بێ خەبەری فەرموو ببینە**
**شەوێك بچۆرە چاخانەی مینە**
**ئەوسا ئەبینی لەهەموو لایەك**
**هەرچەند کەسێکە و چوونە پەنایەك**
**دەوری کاغەزیان داوەو دانیشتوون**
**بۆ وەسلی جۆکەر شێت و شەیدابوون**

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٢/٣٠.
٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/١٣٨.

— — — — — — — — —

**نیفاق و فتنه و جاسوسی و قومار**

**تیایا شارەزان وەکو دانی مار**

**ئینجا بێینەوە سەریاری کەران**

**هەر دەستەی بەجیا بۆت بکەم بەیان**

— — — — — — — — —

**لێکی بەرەوە چاکی بزانە**

**ئەمە ئە حوالی موجتەمەعمانە** (١)

وەك دیارە لێرەدا پیرەمێرد ئەو دیاردە شارستانیانە رەد ناکاتەوە کە خۆش گوزەرانی بۆ کۆمەڵگا دەرەخسێنن، نەك هەر ئەوە بەڵکو رەخنە لەو کەشانەش دەگرێ کە بەعقلێکی دواکەوتوو دەیانەوێ بەری دیاردە چاکەکانی شارستانیەت بگرن، بۆیە لە دەقێکدا چ دەربارەی ئەو دیاردەیەو چ دەربارەی کورتبینی کەسانی سەر بە توێژو چینە کۆمەڵایەتیەکان دەڵێ:

**بێینە سەر حاڵی ئیجتماعیمان**

**ئەخلاقی عەسری چیدده بۆئیمان**

**هەر لەو جێگەدا چایخانەیەك بو**

**پیاوی بێ ئیشی گەلێ تێ دەچوو**

**وەزیری ئەوقاف شێخ ئەحمەد داود**

**چایخانەی سەدکرد چایچی بوو نابود**

**وتی چایخانە لە مزگەوتا یە**

**ئەوانەی لەوێن لە شپسیان تیایە**

**بێینە سەرباسی چایخانەکەمان**

**ئۆدەشرێ بوو تاقی بەرهەیوان**

**شەشیان سیاسی و یەك دوانێ مەلا**

**قیرسچمە و سەر رەق بەئیلاوبیلا**

١ـ محەمەد رەسوڵ (هاوار)، پیرەمێردی نەمر: ل٢٦١.



— — — — — — — —

**نیوە مەلاکان عەجایب ترن**

**بۆ ئێمە مانان قابیل بە کوفرن**

**منەوەرەکان لەلای کافرن**

**...... وەك سەگ دەوەرن**

**مەعاشی خەزنەی لەلا حەرامە**

**رۆن و بەرتیلی لەلا بەتامە**

**لەبەلدیە بەینێ وەکیل بوو**

**هەموو ئیشێکی هەر بەبەرتیل بوو** (١)

دیارە هەر لەو ساڵانەی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا کە لە کۆمەڵی کوردەواریدا و لەرووی ئابوورییەوە سنورێکی دیار لەنێوان چینی هەژاری چەوساوەو چینی دەولەمەندی چەوسێنەردا رەنگ رێژ کرابوو پیرەمێردیان بەرەو وێنەگرتنی ئەو نایەکسانیە کۆمەڵایەتییە برد و لەگەڵێ دەقیدا راستی ئەو جیاوازییە چینایەتیە دەخاتە بەردەست و وەك دەنگێکی پشتیوانی هەژاران رەخنە ئاراستەی ئەو نایەکسانییە کۆمەڵایەتیە دەکات:

**بۆ فەقیر دایم پیس و گلاوە ؟**

**بۆ لەهەموولا هەر دەرکراوە ؟**

**ئینحسار لەبەر ژینی هەژارە**

**نەك بۆ هەرکەسێ کە پارە دارە**

**خۆ من نەفەقیر نە دەولەمەندم**

**مام ناوەنجیم و بێباك و رەندم**

**بەڵام بۆفەقیر حاڵم پەشێوە**

**بێکەس و بێدەرد لەم کەژوکێوە**

**نە رەحمی خوا نەویجدانی کەس**

**نابینم بۆ یان بێتە فریاد رەس**

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/٣٠.

**ئەم گرانییە بەختی توججارە**

**پارەی پێرارییان یەك بە هەزارە** [1]

بوارێك لەو بوارانەی تری رەخنەی کۆمەڵایەتی کە پیرەمێرد بایەخی پێ داوە ئەو دیاردە ناشرینانە بوون کە بە ناوی ئایینەوە و بەبیانووی رەفتاری ئایینییەوە دەکران، دیارە پیرەمێرد خۆی وەك کەسێکی ئیمانداری راستەقینە [2] وەك چۆن دەیویست هەموو دیاردە چەوتەکان بنبڕ بکات هەر بەو جۆرەش دەیویست مرۆڤی ئیمانداری راستەقینە دیوی گەش و پیرۆزی ئایینەکە نیشان بدەن و رەفتاری جوانی موسوڵمانانە بنوێنن.

هەر لێرەوە تیروانینی رووناکبیرانەی خۆی بۆ نوێژ و رۆژوو حەج دەخاتە روو دەڵێ:

**رۆژوو نمازت کە بۆ نیاز بێ**

**وەك عاشقێکی کە پیشەی گاز بێ**

**نوێژی زۆر پیشەی پیرێژنانە**

**رۆژووش ئەسڵەکەی بۆ رەمەزانە**

**سیاحەتی حەج سەیری جیهانە**

**ئەوی بەکار بێ بەخشینی نانە**

**— — — — — — — — —**

**دڵ دەشکێنی و ئەچی بۆ کابە**

**مەچۆ مەزاڵیم لەسەر خۆت لابە**

**من زیارەتی کابەم کرد بەلاَم**

**زیارەتی دڵ پێشترە لەلام**

**لە دەشتی (مینا) قوربانی دەکەی**

**بۆ گورگ و چەقەڵ دیاری دەبەی**

**لێرە سەربرە وبیدە بە برسی**

**دەبێت بەقەڵای (أية الكرسى)** [3]

---

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/٤٨.

٢ـ پیرەمێرد کۆمەڵێ شیعری لەبواری ئایینیدا هەیە کە هەست و سۆزی ئایینی تیا دەربریوە. بروانە: ١/٣٧١، ١/٣٧٦، ١/٣٧٨، ١/٣٨٠، ١/٢٧١، ١/٤١٩ .

٣ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/١٩٧.



لە دەقێکی تریدا و کاتێ سەرنج دەدا مزگەوت وەك شوێنێکی پیرۆزی ئایینی و جێگای کۆبوونەوەی خەڵکی، تیایدا بە رەفتارو هەڵسوکەوتی نابەجێ سیماو پەردەی دواکە وتوویی پێ پۆشراوە لەکاتێکدا کە دەکرێ شارستانیانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ و جوانیەکەی بپارێزرێ بۆیە دەڵێ:

**حەوز گەورەکە کە دەڵێن پاکە**

**پڕە لەقەوزە هەر وەك شیاکە**

**حەوز نی یە ، خەزنەی چڵم و بەڵغەمە**

**هەر بەڵغەمێکی سەلکە شەلغەمە**

**— — — — — — — — —**

**وا دەست نوێژ شۆرا گوێمان لەبانگە**

**بۆرە بۆرێ دێ وەك بۆرەی مانگا**

**مەلا سەعیدە وا سەلاَ دەکا**

**رۆحی بیلالمان بۆ ئیحیا دەکا**

**دوور لە بانگەکە ئەوەم هاتەبیر**

**( أنكر الاصوات لصوت الحمير )** [1]

ئەوەی لەسەرجەمی ئەو دەقانەی پیرەمێرد دا بەدی دەکرێن ئەوەیە کە پیرەمێرد خەم خۆرێکی راستەقینەی کوردەواری بووە و دڵسۆزانە دەیویست کۆمەڵەکەی و نەتەوەکەی لەو دیاردە دواکەوتوانە رزگار کات کە بەری پێشکەوتن دەگرێ لێیان.

هەر ئەو خەم خۆرییەش بوو کە وای لێ کرد لە پەندی پێشینانەوە هەوێنی شیعری بەدەست بهێنێ و لەپێناو گەشەی کۆمەڵایەتیدا بیرو هەست و سۆزی خوێنەران زاخاوبداتەوە، ئەوە بوو هەر لەساڵی (١٩٣٢) ەوە لە هەموو ژمارەیەکی رۆژنامەی (ژیان) و (ژین) دەقێکی شیعریی بە پەندی پێشینان بنیات ناوەو بلاَوی کردۆتەوە بەم کارەشی هەروەك ( فەررەیدون عەلی ئەمین ) دەڵێ (( ئەوەندە شانازی بۆ پیرەمێرد بەسە کەتوانیویەتی دەست بۆ گەنجینەیەکی ئەوەندە بەنرخ ببات، بینەخشێنێ و بیرازێنێتەوە، کەرەنگە ئەگەر یەکێکی تر ئەو دەستەی بۆ ببردایە تێکی بدایە و بیژاکانایە )) [2]، کە

---

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/٢٦.

٢ـ فەرەیدون عەلی امین، چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی شاعیر، بەغدا، چاپخانەی ئیرشاد، ١٩٧١، ل٢٣.

بێگومان کاریگەرییەکی زۆری لەسەر خوێنەران بەجێ هێشت بەو بەڵگەیەی زۆربەی زۆری ئەو دەقانە خوێنەوارو نەخوێنەواری لەبەریان دەکردو رۆژانە دەیان وتەوە، دیارە ئەم پەندانەشی هەموو بوارە سیاسی و نیشتمانی و کۆمەڵایەتیەکانی گرتۆتەوەو بە (( بیری فەلسەفی و ئەفلاقیانەی یان بابەتی کۆمەڵایەتیانەی لەرێگەی پەندی پێشینانەوە لە دەربڕینێکی شیعریدا تەعبیری دەکرد )) [١]، هونەرمەندانە تۆوی ئەو بابەتانەی تیا چاندون:

**هەندێ کەس دڵیان وابە پارەوە**
**ئەچرووسێتە وە بۆی لەپارەوە**
**دڵی هێند پڕە لە دەردی پارە**
**لەیادی قەوم و قیلەی بێزارە**
**عەشقی نیشتمان لای ئەفسانەیە**
**بۆ چرای زەردی زەڕ پەروانەیە**
**هەندێکیش هێندە دەماخیان بەرزە**
**بۆ وەتەن فیدای رۆحیان لافەرزە** [٢]

دیارە ئەم چەشنە بابەتانە بۆ خۆیان و ئەو نیازەشی کە لە پشتیانەوە بووە کە بێگومان چاکسازی کۆمەڵایەتی بووە بۆتە هۆی ئەوەی کە زمانی دەقەکان و لەگەڵێشیدا وێنەکان سادەبن و لەژیانی رۆژانەی خەڵکەوە بێ رووتوش کردن هێنرابنەوە، دیارە ئەم چەشنە مامەڵەیەش لەگەڵ زمان و وێنەی شیعریدا کارامەیی شاعیرانەی دەوێ کە تەنها پیرەمێرد دەسەڵاتی بەسەردا شکاوە:

**بۆ فرۆش بزنی خەڵکی مەدۆشە**
**شیری تۆ بەرن چەند لات ناخۆشە**
**هەرچی چاکەی کرد چاکەی دێتە رێ**
**درەخت بنێژی دیارە بەر دەگرێ**
— — — — — — — —

١ـ فەرهاد پیرباڵ، شیعری نوێی کوردی: ل١٢٧.

٢ـ سەرجەم پەندەکانی پیرەمێرد، کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی فایەق هۆشیار و هاورێکانی، چاپخانەی شڤان، ٢٠٠٧، ل٥١٨.



**هەرچەند کەسەفەر سەنگی مەکە**
**ئەوی ناینasی هاورێی مەکە**

**کەمت لەزۆری خەڵکی چاکترە**
**گۆشتی چۆلەکە لە داڵ پاکترە**
**لەدڵی خۆیشتا خۆت هەڵ مەکێشە**
**لە خود پەسەندی دۆستت دڵ رەشە** [١]

هەر ئەم بوارە فراوانەی شیعری کۆمەڵایەتی پیرەمێرد سەرجەمی ئەو دەقانەش دەگرێتەوە کە وەك شیعری گاڵتەو گەپ دەبینرێن بەو پێیەی بۆ خۆیان هەر لەبازنەی ئەو نیاز و مەبەستانەدا بوون کە شیعرە کۆمەڵایەتییەکانی تریان پێ بنیات نراوە، دەربارەی ئەم جۆرە شیعرە ( د. عیزەدین مستەفا رەسول ) دەڵێ: (( پێکەنین لە ئەدەب و لە ژیاندا جاری وا هەیە هۆیە و جاری وا هەیە لە خۆیدا مەبەسە، ئەوپێکەنینە هۆیە، ئەوە لە کۆڕی ئەدەبیاتدا ئەبێتە ژانەرێکی تایبەتی، ئەبێتە هۆی رەخنە گرتن لە هەموو دیمەنێکی ناهەموار و خوارو چەوت لە ژیاندا ئەبێتە هۆیەکی تیژی گەڕان و پشکنین لە هەموولا، لە هەموو جێیەك لە هەموو کاتێکدا بەدوای کەم و کوری و باری نالەباردا و لە شێوەی گاڵتەدا بەو دیمەنە پەردە لەرووی ئەو کەم کورییە لا ئەدرێ،......... ئەو پێکەنینەی کە (هۆ) نییە و مەبەسە ئەویش جێگەیەکی تایبەتی خۆی لە مەیدانی ژیان و ئەدەبدا هەیە و.......... ئەچێتە ریزی ئەدەبی ئامانج دارەوە چونکە پێکەنینێکیش کە لە خۆیدا مەبەس بێت ئەویش هەر ئامانج و مەبەسێکی لەژیاندا هەیە و لە ئەنجامدا ئەبێتە هۆ نەك مەبەس )) [٢]، جا بەگشتیش ئەوەی دەبینرێ ئەوەیە کە سەرجەمی گاڵتەو گەپەکانی پیرەمێرد بۆ خۆیان چەشنە رەخنەگرتنێکی تربوون لە دیمەن و دیاردە چەوتەکانی ناو ژیانی کوردەواری:

**هەلاج بوون بە ژن، تەشبیە نەماوە**
**رۆژی بیستوپێنج وا دە تەواوە**
**خۆ بەلەدیەش ئەعزای پێ دەوێ**

١ـ سەرجەم پەندەکانی پیرەمێرد: ل٥١٨.

٢ـ د. عیزەدین مستەفا رەسول، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فولکلوری کوردی، سلێمانی، چاپخانەی زانکۆ، ١٩٧٩، ل١٦١ــ ١٦٢.

**ئەو بێ پارەیە کەس دوای ناکەوێ**
**هەر مەبعووسییە کە نەفت و پوختە**
**ئەعزایەتی تر بێگارە سووختە** [1]

ئەوەشی کە تێبینی دەکەین ئەوەیەکە زۆربەی ئەو دەقانەی کـە دەچـنە خانـەی گاڵتەوگەپـەوە هەنـدێکیان بەشـێوازی چـیرۆك بنیـات نـراون و هەنێکیـشیان خراونەتـە نـاو چوارچـێوەی پەنـدی پێشینانەکانییەوە.

١ـ فایەق هوشیار و هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/١٦٠.



## ٤- شیعری جوانکاری

بەشێك لەو دەقە شیعریانەی پیرەمێرد کە دەکرێ بخرێنە ناو چوار چێوەی شیعری جوانکارییەوە ئەو دەقانەن کە ئافرەت وەك جوانی و وەك خۆشەویست بوونەتە تەوەرەی بنیاتنانیان، بـەو پێیـەی بـە تاقیکردنەوەیەکی سۆزدارانەی راستەقینەی پیرەمێـرد دانـانرێن و زیـاتر وەك سـنعەتکارێکی شـیعری مامەڵەیان لەگەڵدا کراوەو جوانی دەقەکان خۆیان مەبەست بوون نەك باس و بابەتی ناو دەقەکان:

**دانیشتبووین لەگەڵ یار        من سەرمەست و ئەو هوشیار**
**بەتیلای چاوی بیمار        دڵمی فڕاند بە یەکجار**
**شوێن دڵم کەوتم ناچار**

— — — — — — —

**ئینجا هاتە سەرینم        چاوی کەوت بەلەرزینم**
**گیان گەیبووە بەربینم        یەخەی لادا بیبینم**
**رووناك بوو دەرو دیوار**
**مانگ بەکەتان رازابوو        دوو دوگمەی ترازابوو**
**دوو نار لەنوور سازا بوو        باڵادەستی بەیزا بوو** [1]
**نووری توور لای تیرەوتار**

ئەم چەشنە روانینەی پیرەمێرد وەك دڵدارێکی شەیدا بۆ ئافرەت و جوانییـەکانی بۆتـە پرسـیار لەبەر دەمی هەندێ لە نووسەراندا کە (( ئایا هۆی ئەم سۆز و دڵدارییە و ئەم شیعرە تـەرو پـڕ سـۆز و پاراوەی پیرەمێرد چی بووەو لە چ سەرچـاوەیەکەوە هـەڵقوڵاوە )) [2]، ( محەمـەد رەسـول هـاوار ) بـۆ وەڵامی ئەم پرسیارەی خۆی دەڵێ: (( پیرەمێردی قوتابی بێسارانی و مەولەوی، پیرەمێردی جێ نـشینی وەلی دیوانە، ئەو شاعیرانە بە هەست و هۆشیانەوە، کە هەریەکەیان لە کـاتی خۆیـدا لەراسـتی خـۆی

١ـ فایەق هوشیارو هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٢/١٢.
٢ـ محەمەد رەسول (هاوار)، پیرەمێردی نەمر: ل١٥٣.

تەنورێکی دڵداریان داختستبوو............... تـەنووری ئـەو شـاعیرانە هێـشتا گـەرمی و ژیلـەمۆی ئەوەندە مابوو کە پرەمێرد لەسەر خۆ نانێکی سارده تەنووری جوان و ناسکی پێ ببرژێنێ و بیکـا بـە پێخوری ژیانی خۆی، بەڵێ کەواتە شیعری ئەو شاعیرانە بووە کە بوونەتە هۆی کارتێکردن لە هەست و هۆشی پیرەمێرداو بوونەتە هۆی هێزێك کـە گـۆمی دڵـی پیرەمێردیـان هەمیـشە ئەهێنایـە جووڵـە و شلەقاندن وماوەی مەنگی و بێ دەنگیان نەئەدا )) [1].

دیارە لێرەدا ئەم بۆ چوونەی ( هاوار ) لەو لایەنەدا راست دەکات تۆوی ئەو دەقانەی لە شیعری شاعیرانی کلاسیکییەوە بە دەست هێناوە، هەر بۆیە بە نازناوی خواستراوەوە بڵاوی کردونەتەوە، بـەڵام دیارە هەروەك دەقە کلاسیکییەکانیش جوانی دەقەکان خۆیان مەبەست بوون هەر وەك چـۆن دەربـارەی (نالی ) دەیوت (( لەنەزەر نالیدا شیعر ئەسڵ و غایەیە قەت بەوەسیلەی بەکارنەهێناوە )) [2]

**گیانە وەنەوشە و چنوور لەگەڵ گوڵ**
**سەودای دیدەنی تۆیان کەوتە دڵ**
**چنوور لەکێوان، وەنەوشە لە چەم**
**گوڵ لەگوڵستان، یەکیان گرت سەرجەم**
**هەرسێکیان تێکرا گفتوگۆیانە**
**هەوڵی هاتنی خزمەت تۆیانە**
**هاتنە لام وتیان: تۆرابەرمانبە**
**ئەمەمان بۆبکەو تاجی سەرمانبە**
**ئەوا هەرسێکم بەستن بەدەستە**
**هاتنەخزمەتت بەدەستی بەستە**
**هەریەك بەرەنگی مەرامی پێتە**
**گیانیان بەدیاری خاکی بەرپێتە**
**چنوور بۆ زوڵفت لوول و پەشێوە**
**وەنەوشە مل کەچ خاڵی لای لێوە**

١ـ محەمەد رەسول (هاوار)، پیرەمێردی نەمر: ل١٥٤ .

٢ـ رۆژنامەی ژیان، ژ (٢٩٣) ی ١٤/ئەیلول/١٩٣١.



**گوڵ کە نازکی گۆنای تۆی دیوە**
**چقڵی خۆی لە ژێر پێی هەڵچەقیوە**
**تۆ ساحیب پایەی شای شیرین ئەندام**
**با لە سایەتا بگەنە مەرام** [1]

وەك بە ئاشکراش دەبینرێ ئەو چەشنە تۆوەی شیعری جوانی کە پیرەمێرد لـە شـیعری کلاسـیکییەوە بەدەستی هێناوە بەزمانە کوردییە پەتییەکەو بەوێنەی شیعری نوێی داهێنەرانە چرۆی پێکردونەتەوە، هەربۆیـە بەشێك لە جوانی ئەو دەقانە لە جوانی چنینی وێنەکاندایە بە زمانێکی کوردی پەتی پاراو کـە کـەم شـاعیری کلاسیکی و نوێش توانیویەتی دەقی واجوان بە هەوێنی ئافرەت و جوانی ئافرەت بنیات بنێ:

**کەوا بێ بارێ ئەی بەرگوزیدە**
**بگوێزەرەوە گلێنەی دیدە**
**برژانگەکانم ببێت بە پەرژین**
**رێی گوزەر نادا بەدیدەی بەدبین** [2]

دیاریشە کە لە ناو ئەو شیعرە جوانانەدا وەك دەقی لیریکی بێبەش نەبون لە داچۆراندنی خەم و پەژارەی کۆن و تازەی خودی پیرەمێرد خۆی:

**وەك مـن دەردەدار، وەك مـن دەردەدار**
**ئای بۆ یارێکی وەك مـن دەردەدار**
**سەیری بەهارکەین دیارەو دیار**
**گوڵان ببینین رەنگ رەنگ بەقەتار**
**لەهەر رەنگێکیان خەمێ وەرگرین**
**بەهەر خەمێکی تێروپر بگرین**
**لەوەنەوشە شین لەنێرگز خومار**
**گوڵاڵە خوێنی دیدەی شەو بێدار**
**لەخونچە پەیکان لەسەوسەن گوڵخار**

١ـ فایەق هوشیارو هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/٢٠٩.

٢ـ محەمەد رەسول (هاوار)، پیرەمێردی نەمر: ل١٦٦.

**له نەورۆز بۆ دڵ زامی پڕ ئازار**
**چنوور وەك پێوەند چنار سەرداره**
**هەمیشه بەهار وەك وەرەمداره**
**ڕێحانه پەلكی شینی ماتەم بێ**
**مینا، مینای غەم لانەشئەی كەم بێ**
**بەڵام هەر تەنها خۆم دەردەدارم**
**هەر خۆم به باری غەمان غەمبارم** (١)

هەر ئەم چەشنه هێنانه ناوەوەی ئافرەت وەك هەوێنێكی بنیاتنانی ئەو دەقه جوانانه بۆته هۆی ئـەوەی كه ( محەمەد رەسوڵ هاوار ) و ( د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ ) یش له ژێر ناوی ( شیعری دڵداری) دا ئاوریـان لێ داونەتەوه، كه دیاره بەلای ئێمەوه بەو چەمكه بەدڵداری دانانرێن كه رەنگ پێـدەرەوەی تاقیكردنەوەیـەكی خۆشەویستی شاعیربن، چونكه ئەو تاقیكردنەوەیه له ژیانی پیرەمێرد دا بـەدی نـاكرێ. لەگـەڵ ئەوەشـدا ( د. عیزەدین مستەفا رەسول ) رای وایه كه (( شیعری دڵداری پیرەمێرد هەندێكی پێرەوی شاعیران كردنه ـــ واته تەقلیدی ـــ یەو هەندێكی جۆرێكه له یادكردنەوەی رۆژانی لاوێتی و له تەمەنی پیریـدا بەیادكردنـەوەی ئـەو رۆژانەیەو دەربرینی سۆزی ئەو كاته و بۆ چروكی به یار نەگەیشتن و ناكامییه، تەنانـەت ئـەم چەشـنه سـۆزی دەربڕینه هەندێ جار نائومێدییەكەی بەرەو جۆرێكی نزیك له دڵداری شاعیرانی سۆفییەوه دەبات )) (٢).

دیاره بوونی خەم و پەژاره و نائومێدی لەو دەقانەدا وەك ناوەرۆك بۆ خۆیان بەشـێكن لـه سروشـتی بابەتەكه كه وەك وتمان نەكراونەته هۆكاری گەیشتن به ئامانجێك كه گەیاندنی دەنگی سۆزداری پیرەمێرد بێ بەخۆشەویستێك، هەر بۆیه ناشخرێنه ریزی دڵداری شاعیرانی سۆفییەوه كه خۆشەویستی لایان خۆشەویستی حەقیقی بووه نەك مەجازی كەدیاره بۆ پیرەمێرد نەحەقیقی بووه و نەمەجازی.

هەر لەناو ئەم جۆرەی شیعری پیرەمێرد دا ئەو دەقانەش شوێنی خۆیان دەكەنەوه كه مەبەست لـه بنیاتنانیان دا هێنانێكی هونەری دەق بووه بەو مەبەستەی تواناو لێ هاتوویی شاعیری پێ بخرێتـه روو واته جۆرێك بوون لەو جۆره دەقانەی كه یاری كردن بوون به زمانی شیعر وەك لەو دەقەیدا كه بـەناوی (هەڵبەستی بێ نوقته ) بڵاوكردۆتەوه و دەڵێ:

١ـ فایەق هوشیارو هاورێكانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/٢١٦.
٢ـ د. عیزەدین مستفا رەسول، ئەدەبیاتی نوێی كوردی: ل٦٢ .



**وا دەمی دەورەی رواحه گوڵ لەسەحرا رۆح ئەدا**
**(موڵ) له دەورەی گوڵ ودڵ گاهی له سڕی لەح ئەدا**
**گهوری سووری لاله ئاگری گووری موسا هەڵ دەكا**
**ئەو گره تەراره ئەم (سیحری حەلاڵه) حەلدەكا**
**هەرده ئاڵ و سوورومۆره وەك كەوای سوورمەی عەرووس**
**گوڵ گەڵای لول كردووه وەك گورەی دڵداری رووس** (١)

دەقێكی تری پیرەمێرد لەم بوارەدا ئەو دەقەیەتی كه به پێچەوانەی دەقی یەكەمەوەیەو هەموو وشەكانی خاڵدارن و دەڵێ:

**نەخشی چین، چین جەبین**
**پێشی بەچینی، چنین**
**خەفەتیش پشتی جنین**
**پشت بێپشتینی بەتین**
**بێبەش بێجێ بێجەژنین**
**تیغی تیژی قەز بێنین** (٢)

دەقێكی تری پرەمێرد كه دەكرێ لەریزی ئەم دەقانەدا دابنرێن كه جوانكاریانه بنیات نراوەو خودی زمانەكـه خۆی تیایدا مەبەست بووه نەك ناوەرۆك ئەو دەقەیەتی كه به ناونیشنای ( لێوی خونچه ) یه وتیایدا دەڵێ:

**لێوی خونچەی هەڵده پرژێ هەر سەحەر خەرواری ماچ**
**بۆیه سەرگەردانه وەك من بولبولی بێداری ماچ**
**عالەمێ موشتاقی ماچی كوڵمی ئاڵی دولبەره**
**سەیری چەند زۆره له دنیادا بەدڵ كڕیاری ماچ**
**لێوی پڕ خەندەت له قامیشی شەكر شیرینتره**
**مشتەری ئەمرۆ لەشەككەر زۆرتره بازاری ماچ**
**تاسەحەر بۆ چی له لێوت بۆسەیەكم دەست نەكەوت**
**لێو له شوێنی لێوت كوا ؟ واته پی شەوگاری ماچ** (٣)

١ـ فایەق هوشیارو هاورێكانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/١٤.
٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٣٣١.
٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٢٩٥.

## ٥- شیعری بۆنەیی ( مناسبات )

بێگومان هەموو دەقێکی شیعری ڕەسەن تۆوی لە دایك بوونەکەی لە تاقیکردنەوەیەکەوە بەدەست دێ کە شاعیر پێیدا تێپەڕیوە، جا تاقیکردنەوەکان بینراوبن یا بیسراو یان یادەوەری شاعیر بن، بۆ یە بەلای هەندێ نووسەرەوە هەموو دەقێك بۆنەیەکی لە پشتەوەیە، دیارە ئەمەش ڕاستە بەڵام ئەو تاقیکردنەوانەی کە بە ئاشکرا و ڕاستەوخۆ لە بۆنەیەکەوە سەرچاوەیان گرتووە بۆ خۆیان ڕەنگ پێدەرەوەی ڕاستەوخۆی بۆنەکەش دەبن، هەر بۆیە دەکرێ بەجیا سەرنجیان ئاراستە بکرێ.

جا پیرەمێردیش وەك شاعیر لەگەڵێ بۆنەدا ڕاستەوخۆ تۆوی شیعری بەدەست هێناوەو دەقی جوانی پێ بنیات ناون، تایبەتمەندییەکی تری ئەو دەقانەی کە دێنە ناو ئەم بوارە شیعرییەی پیرەمێردەوە بۆ خۆیان بۆنەو مێژووەکەشیان دیاری کراوە، دیارە ئەو بۆنانەی کە پیرەمێرد شیعری بۆ وتوون بۆنەی جۆراو جۆرن، هەندێکیان بۆکەسی دیاری کراو وتراون و هەندێکیشیان بۆ ڕووداوە خۆش و ناخۆشەکانی ژیانی کۆمەڵانی خەڵك وتراون، لەدەقێکیدا کە مێژووکەی (٣١/مارت/١٩٣٢ ) ە بە بۆنەی کۆچی دوایی خوشکێکی ( ئەحمەد بەگی توفیق بەگ ) ەوە دایناوە دەڵێ:

**وا بەکوڵ دەگریم لەگەڵ تۆ هەوری سووری بەهمەنی**
**من بەوەی گوڵ کەوتە ژێرگڵ، تۆبەوەی گوڵ پێکەنی**
**تازە گوڵ ! بۆ تۆ بوو ئەم چەندانە سەیرمان ئەکرد**
**تۆ بەجێت هێشتین، گوڵستان بوو چاهی بێژەنی**
**دایکی خاك ! وەك دایکی بیگرە باوەش، ئازاری مەدە**
**جێگەکەی تاریکە، واترسا و لەخەودا ڕاچەنی**
**دوێنێ نەورۆزم بەبەژنی نەو گوڵانی ئاڵ ئەکرد**
**دەوری دەوران دەورەمی ئەمرۆ بەبەرگی شین تەنی**
**نیوە بەیتی دوایی، ڕۆژی ڕۆینی ئەو دەردەخا**
**من ئەزانم سێبەری تووبایە، بۆ ئەو نیشتەنی** [1]

١ـ فایەق هوشیارو هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/١٠.



هەروەها بۆ ( سانحەی ئەمین زکی بەگ ) یش دەنووسێ و دەڵێ:

**ئەستێرەیەکی گەش بە زیای مانگی بەدرەوە**
**سەر گۆیژە کەوت و بۆ وەتەنی خۆی، چرای شەوە**
**ئەسلی لەنەسڵی قوتبی شیمالە بە ڕەوشەنی**
**وەك بێچووە قوتبە، مەرکەزی زەورانشینی**
**چەند ساڵ لە خوام ئەویست لەکچاندا یەکێکی وا**
**لەم خاکە هەڵکەوێ و بە زەکا بێ، بەجێ ی هیوا**
**وا ئەم هیوایە هاتۆتە دی، زۆر بەدڵ خۆشی**
**جینسی لەتیف و شیعری سنووحاتی دڵ کەشی** [1]

ئەوەی لەو دوو دەقەدا سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیەکە هەر دوو بۆنەکە سۆزێکی ڕاستەقینەی لە دەروونی پیرەمێرد دا وروژاندووە بۆیە بەو پتەویە بنیات نراون، هەر ئەو چەشنە سۆزەش لەگەڵێ لەودەقانەیدا بەدی دەکرێن کە بۆ کۆچی دوایی کەسانی تری خۆشەویست لای پیرەمێرد وتراون، ئەمە جگە لەوەی کە زۆربەی با بەتی ئەو بۆنانەی ئاوێتە کردووە بە بابەتی تری نیشتمانی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەوە، ئەوەتا بە بۆنەی کۆچی دوایی ( مستەفا پاشای یامولکی ) یەوە دەڵێ:

**مستەفا پاشا بۆیە پەسەندە**
**فەخری بەکورد بوو لای خواوبەندە**
**لەوەسیەتیش دا خۆی لێ نەگۆڕا**
**بەوەسیەتی خۆی لەسەیوان نێژرا**
**لەسەر کوردێکمان غیرەتی وا بوو**
**بەگژ شاهەکەی ئێراندا ئەچوو**
**بیگرە باوەشت ئەی گردی سەیوان**
**پاشای کوردستان هاتووە بەمیوان**
**کوڕ گەل گەورەتان ئەگەر خۆش ئەوێ**

١ـ فایەق هوشیارو هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/١٩٤.

**زۆر گەورەی ترتان تیا هەڵ دەکەویٚ**

**ئەمرۆ ئەم یادە بووە بە یادگار**

**زۆر کەس هەوڵ ئەدا بۆ مان بێتەکار** (١)

بەبۆنەی یەککەوتنی جەژنی نەورۆزو جەژنی لەدایك بوونی پێغەمەر ( د. خ ) لە (٢١/مارت/١٩٤٢) دا زیرەکانە ئەو بۆنەیە دەکاتە تۆوێکی شیعری و بابەتی تری پیٚ چەکەرە دەکاتو دەڵیٚ:

**رەبیعی عەرەب، نەوبەهاری کورد**

**دەست لەملانیان لە نەورۆزا کرد**

**جەژنی مەولوودی پێغەمبەرمانە**

**وامەولودمان کرد بە نەورۆزانە**

**ئەم دوو جەژنەمان کەوا یەککەوتن**

**رێی رێکەوتنە، خوا رێکیخستن**

**ئاگری نەورۆزمان کە کرایەوە**

**بەو ئاگرە ئاگری شەر کوژایەوە**

**ئاگری نەورۆزمان لە (هیتلەر ) بەردا**

**خۆڵی مردوومان بێژا بە سەردا**

**کە خۆڵی مردووی کرا بە سەردا**

**دەستی لەیەخەی شەڕ و گەڕ بەردا**

**کە هیتلەر نەما غوولی یابانی**

**زۆری نامێنیٚ بۆ مل شکانی** (٢)

دیارە ئاساییە کە لەهەندیٚ بۆنەدا وێنەی هەواڵدەر مەبەست بوویٚ، بۆیە ئەو دەقانەی بۆ ئەو بۆنانە وتراون سۆزدارانە نابینرێن و زمانەکەشیان بەو هۆیەوە لەو ئاستە هونەریەدانین کە بەزمانی شیعری دابنرێن وەك لەم دەقەیدا کە بۆ بەخێرهاتنی ( ئەمین زکی بەگ ) و ( سالح زەکی بەگی ساحێبقران ) وتویەتی تیایدا دەڵیٚ:

١ـ فایەق هوشیارو هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/٢٣٢.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢/٧٨.



**ئەمین زەکی بەگ، سالح زەکی بەگ**

**ئەم دوو زیرەکە دوو شوعلەن یەك یەك**

**ئەمین زەکی بەگ پێشکەوت، ئەمرۆ دیٚ**

**سالح زەکی بەگ دوای ئەو دەرکەویٚ**

**یاخوا بەخێربێن چاوگە لمان رۆشن**

**هەردووکیان بۆمان زۆرتێدەکۆشن** (١)

کەواتە دیارە ئەم جۆرە دەقانە بۆ خۆیان هەر ئەوەندە دەهێنرێنە ریزی شیعرەوە کە ئاواز دارن، ئەگینا باس و خواسێکی رۆژانەن و خراونەتە قالبی شیعرەوە، هەروەك لەو بەیتەشیدا کە بۆ ( شێخ لەتیفی دانساز ) ی ناردووەو تیایدا دەڵیٚ:

**شێخێکی لەتیف لە لوتفکاری**

**کلێشەی ژینی ناردووە بەدیاری**

**ژین بە فەخرەوە نایەسەر وەك تاج**

**بەو خەتە جوانە ئەگاتە رەواج** (٢)

هەر لێرەدا بەپێویستی دەزانین ئاور لەو دەقانەش بدەینەوە کە بە بۆنەی دەرچوونی گۆڤار و رۆژنامە کوردیەکان یاخود کردنەوەی قوتابخانە وتویەتی، ئەم بۆنە و هەنگاوە رۆشنبیریانەش بەلای پیرەمێردەوە یەکێکە لە هۆ سەرەکیەکانی پلەی پێشکەوتن و دروشمی بەرەو پێشچوونی میللەتە و ((ئەم بیروباوەرەش خۆی لە خۆیدا بیروباوەری زۆربەی هەرە زۆری شاعیرو نووسەرە رووناکبیرەکانی ئەو قۆناغە بووە و لەبەر هەمی شیعری و ئەدەبی ئەو سەردەمە دا بە ئاشکرا رەنگی داوەتەوە ))(٣)، هەر ئەم باوەش کردنەوەی پیرەمێرد بۆ ئەم بۆنە رۆشنبیریانە وای کردوە هەمیشە وەك دڵسۆزێك چاوەرێی دەرچوونی رۆژنامەیەك یان گۆڤارێك بکات و هەر کاتێکیش کە ئاواتەکەی هاتبێتەدی ئەوا خێرا هەست و سۆزی خۆی بە دەقێکی شیعری بۆ دەربریوە و پیرۆزبایی بۆ ناردووە، یاخود بە پێچەوانەشەوە هەرکاتیٚ گۆڤارێك یارۆژنامەیەکی کوردی داخرابیٚ بەهۆی بارو دۆخی سیاسییەوە ئەوا بەدەقێکی شیعری خەم و پەژارەی خۆی بۆ دەربریوە، ئەوەتا لەگەڵ دەرچوونی رۆژنامەی ( کردتعاون و ترقی غزتەسی ) سالی (١٩٠٨) دا و لە شیعری (ئەمرۆ) دا دەڵیٚ:

١ـ فایەق هوشیارو هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ٣/١١٤.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ٣/١٤٣.

٣ـ محمد فاضل مصطفى، زێوەر ژیان و بەرهەمی (نامەی ماستەر): ل٢٤.

**ئەمرۆ کە رۆژی جەژنی هەموو مانە سەر بەسەر**
**کوردیش لەگەڵ گەلان لە چلە خانە هاتە دەر**
**سێ ساڵ بوو رۆژوو، رۆژی بەساڵی لەبەردەچوو**
**رۆژووی حەرام بوو، خێری لەبەر شەڕ دەبوو بەشەڕ**

— — — — — — — — —

**تیری دوعا، کە کورتی ئەکرد، ئێستە سەر دەکا**
**مەیدانی کورد کە کورت بوو، بووە دەشتی رەی بەبەر**
**هەرچی بوو، هەرچی هات بەسەر ئەودا بەسەر چوو**
**ئەمرۆ بە یەکێتی ئەبێ بەستین قەدو کە مەر** [1]

دیسان هەر لەم بوارەدا بە بۆنەی دامەزراندنی ( کۆمەڵی زانستی کوردان ) ی ساڵی (١٩٢٦) دەقێکی شیعری بڵاوکردۆتەوەو لە ئاهەنگی کردنەوەیدا خوێندویێتیەوە و دەڵێ:

**بەرز و بڵندە هێندە دەرەجەی خاکەکەی وەتەن**
**هێشتا بەهاری ئێمە نەهات، سەوز نەبوو چەمەن**
**چوار لا بەهارە بەزمە نەوای سازو زیلەیە**
**لای ئێمە شەستە، سەر بەکڵاوەو رەهێڵیە**

— — — — — — —

**مژدەی بەهاری پێیە شکۆفەی نیهاڵی گوڵ**
**وەك ئایەتی ژیانەوە، ئومێد ئەدا بەدڵ**
**ئەمشەو گوڵی ئومێدی وەتەنمان دەپشکوێ**
**میللەت، ئومێدەوارە بە زانستی سەرکەوێ** [2]

هەر لەم رووەوە و بەبۆنەی دەرچوونی گۆڤاری ( گەلاوێژ ) ەوە دەڵێ

**ئۆ خەی (گەلاوێژ) وا دەرکەوتەوە**
**وەك چرای بەختی کورد سەرکەوتەوە**

١ـ فایەق هوشیارو هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/٢١٣.
٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ١/٣٠٢.



**(یانەی سەرکەوتن ) بەتۆ رووناکە**
**کوردستان بە رووی تۆ فەرحناکە**
**شەوقی دیدارت رووناکی چاوە**
**ئیتر تەوژمی گەرما نەماوە**[1]

لە راستیدا لەم رووەوە هیچ بۆنەیەك بەلای پیرەمێرد دا تێنەپەریوە بێ ئەوەی پیرەمێرد دەقێکی شیعری بۆ بنیات نە نابێ ئەمەش زیاتر لە پەرۆشی و دڵسۆزییەوە بوە بۆ نەتەوەکەی.

بەم جۆرە بایەخدانی پیرەمێرد بەهەموو ئەو بابەت و بوارە شیعریانە بووە مایەی ئەوەی کە دەنگێکی هەرەدیاری نوێکەرەوەو دەوڵەمەندی شیعری کوردی بێ لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، دەنگێك کە دەکرێ بەرەنگ رێژکەری شیعری نوێی ناسیونالیستی دا بنرێ لە ئەدەبی نوێی کوردیدا.

١ـ فایەق هوشیارو هاورێکانی، دیوانی پیرەمێرد: ١/٢٥٥.

## ئەنجامەکان

١ــ پیرەمێرد وەك هەر دەنگێکی شیعریی سوودی لە تاقیکردنەوەی شیعری کۆن و نوێی کوردی میللەتانی دراوسێش وەرگرتووە و وشیارانە بەشێك لە هەوێنی نوێخوازی شیعریی لێ بەدەست هێناوە.

٢ـ بەشێکی تر لە دیدی نوێخوازیانەی شیعری پیرەمێرد لە تێروانینە سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکانیەوە رایەڵە کراون کە بۆ خۆیان بیرو تێروانینی نوێخوازیانە بوون لەو بوارانە دا.

٣ــ پیرەمێرد بە خۆ دوورخستنەوە لەو رێچکە شیعرییەی کە (شێخ نوری شێخ سالح)بە لاسایی کردنەوەی ئەدەبی تورکی بناغەکەی دارشت رێچکەیەکی شیعریی نوێتری کردەوە کە سیما دیارەکانی بریتی بوون لە زمانێکی کوردی پەتی رەسەن و وێنەی شیعری رەنگکراو بە کلتوری خۆماڵی و ناوچەیی و جیهانی و ئاوازی شیعریی بنیات نراو بەکێشی بڕگەیی و قافیەی مسنەوی.

٤ــ پیرەمێرد توانیویەتی وشیارانە و هونەرمەندانە هونەری شیعر بکاتە رەنگ پێدەرەوەی مەبەستە سیاسی و نیشتمانی و نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتییەکان و بۆنەکانی ژیانی رۆژانە، ئەم چەشنە ئاراستە کردنەی شیعریش بەرەو ئەو مەبەستانە نەبۆتە هۆی ئەوەی کە دووری بخاتەوە لەمامەڵەکردنێکی جوانکاریانە لەگەڵ شیعردا و توانا شیعریەکەی بپوکێنێتەوە.

٥ــ لە هەموو ئەو مەبەستە شیعرییانەشدا دەنگی نوێخوازیانە و دیدی نوێخوازیانەی پیرەمێرد بەدی دەکرێ بەرادەیەك کە لە رووکردنە هەندێ مەبەست و بابەتی شیعریدا بۆتە رێچکە شکێن.

٦ــ هەر لەسەر بناغەی ئەو رێچکە نوێیەی پیرەمێرد بووە کە (گۆران) توانی رێبازی شیعری نوێی کوردی هەڵچنێت و ببێتە قوتابخانەیەکی شیعریی نوێ لە کرمانجی خوارووودا.

# سـەرچاوەکـان

## سەرچاوە کوردییەکان

### ــ کتێبە کوردییەکان


ــ ئەنوەر قادر محمد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، سلێمانی، دەزگای سەردەم، ٢٠٠١.

ــ ئومید ئاشنا، پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی، بەرگی یەکەم، هەولێر، دەزگای ئاراس، ٢٠٠١.

ــ د. ئیحسان فۆاد، سەودا و سنوور، سلێمانی، چاپخانەی روون، ٢٠٠٠.

ــ د. پەرێز سابیر، رەخنەی ئەدەبی کوردی و مەسەلەکانی نوێکردنەوەی شیعر، هەولێر، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٦.

ــ پیرەمێرد، ئاوەرەشی دەریای سوور، سلێمانی، چاپخانەی ژیان، ١٩٤٠.

ــ پیرەمێرد، دوانزە سوارەی مەریوان، سلێمانی، چاپخانەی ژین، ١٩٥٩.

ــ د. دلشاد عەلی، بنیاتی هەڵبەست لەهۆنراوەی کوردیدا، سلیمانی، چاپخانەی رەنج، ١٩٩٨.

ــ دڵشاد عەلی، دیلان شاعیر و ئازادیخواز، بەغدا، چاپخانەی کۆری زانیاری عیراق، ١٩٨١.

ــ د. دلشاد عەلی، دیلان و تاقیکردنەوەی شیعری، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٧.

ــ دیوانی ئەحمەد موختار بەگی جاف، ئامادەکردن و بەراورد کردن و لێکۆڵینەوە و پێشەکی بۆ نووسینی ( د. عیزەدین مستەفا رەسول )، بەغدا، چاپخانەی الادیب، ١٩٨٦.

ــ دیوانی پیرەمێرد، بەرگی یەکەم، فایەق هوشیار و هاورێکانی، بەغدا، وەزارەتی رۆشنبیری، ١٩٩٠.

ــ دیوانی حەمدی، لێکۆڵینەوەی جەمال محەمەد ئەمین، سلێمانی، چاپخانەی سەرکەوتن، ١٩٨٤.

ــ دیوانی گۆران، محەمەدی مەلاکەریم کۆی کردۆتەوە و ئامادەی کردووە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیووە، بەغدا، چاپخانەی کۆری زانیاری عیراق، ١٩٨٠.

ــ دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس، بەغدا، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، ١٩٧٦.

ــ رەفیق حیلمی، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی دووەم، بەغدا، چاپخانەی الشباب، ١٩٥٦.





ــ رەمزی قەزاز، بزوتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدە هەمەوە تا ناوەراستی چەرخی بیست، سلێمانی، چاپخانەی ژین، ١٩٧١.

ــ سەرجەم پەندەکانی پیرەمێرد، کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی فایەق هوشیار و هاورێکانی، چاپخانەی شڤان، ٢٠٠٧.

ــ سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوردیدا ( ١٩٧٠ــ١٩٩١)، سلێمانی، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٤.

ــ د. شوکریە رەسول، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، هەولێر، چاپخانەی خوێندنی باڵا، ١٩٨٩.

ــ عبدوڵلا ئاگرین، شیعری سیاسی کوردی لە باشووری کوردستان، ١٩٩٦.

ــ د. عبدوڵلا خدر مەولود، لێکۆڵینەوەیەك لەشیعری حەمدی، هەولێر، چاپخانەی رۆشنبیری، ٢٠٠٤.

ــ عەزیز گەردی، رابەری کێشی کلاسیکی کوردی، سلێمانی، چاپخانەی دیکان، ٢٠٠٣.

ــ عەلادین سجادی، ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی، بەغدا، چاپخانەی مەعاریف، ١٩٨٦.

ــ د. عیزەدین مستەفا رەسول، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، هەولێر، چاپخانەی فێرکردنی باڵا، ١٩٨٩.

ــ د. عیزەدین مستەفا رەسول، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فولکلوری کوردی، سلێمانی، چاپخانەی زانکۆ، ١٩٧٩.

ــ غەفور میرزا کەریم، کۆمەڵەی زانستی کوردان، بغداد، چاپخانەی جاحڤ، ١٩٨٥.

ــ فاچل مجید محمود، سروشت لە شیعری گۆراندا، سلێمانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٧.

ــ فەرهاد پیربال، شیعری نوێی کوردی ( ١٨٩٨ــ١٩٥٨)، هەولێر، دەزگای کوردستان، ٢٠٠٥.

ــ فەرەیدون عەلی ئەمین، چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی شاعیر، بەغدا، چاپخانەی ئیرشاد، ١٩٧١.

ــ د. کامل حسن عزیز البصیر، رەخنە سازی ــ مێژوو پیرەوی کردن، بەغدا، چاپخانەی کۆری زانیاری عیراق، ١٩٨٣.

ــ د. کەمال مەزهەر، رێنیسانس، وەرگێرانی فۆاد میسری، بەغدا، چاپخانەی الحوادپ، ١٩٨٤.

ــ گۆران، نووسین و پەخشان وەرگێراوەکانی، ئامادەکردنی ئومید ئاشنا، هەولێر، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٢.

ــ د. مارف خەزنەدار، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی یەوە، بەغدا، ضاشخانةى المؤسسة العراقية للدعاية و الطباعة، ١٩٨٤.

ــ د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، هەولێر، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٥.

ــ د. محەمەد دلیر ئەمین میسری، رۆژنامە نووسی کوردی و بزوتنەوەی ئەدەبی لە سایەی یەکەمین دەسەڵاتی سیاسی کوردیدا، سلێمانی، چاپخانەی ژیر، ٢٠٠٤.

ــ محەمەد رەسول (هاوار)، پیرەمێردی نەمر، بەغدا، چاپخانەی العانی، ١٩٧٠.

— محەمەد رەسول (هاوار)، شێخ محمودی قارەمان و دەولەتەكەی خوارووی كوردستان، بەرگی دووەم، لەندەن، ١٩٩١.
— محەمەد سالّح دیلان، بارانی سلێمانی، ئامادەكردنی ئومید ئاشنا، هەولێر دەزگای ئاراس، ٢٠٠١.
— حەمە ئەمین قادر (كاكەی فەلاح)، كاروانی شیعری نوێی كوردی، بەغدا، چاپخانەی كۆڕای زانیاری كورد، ١٩٧٨.
— محەمەدی مەلا كەریم، بیری كۆمەلاّیەتی و سیاسی پیرەمێرد، بەغدا، چاپخانەی دارالحریە، ١٩٩٢.
— محمد صدیق عارف، كامەران و هۆنراوەی نوێ، بەغدا، چاپخانەی مەعاریف، ١٩٥٨.
— مستەفا سالّح كەریم، باغێك لە وشە، سلێمانی، چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٦.
— یادی پیرەمێرد، لەژێر چاودێری عەلادین سجادی، بەغدا، چاپخانەی مەعاریف، ١٩٥١.


## ڕۆژنامە كوردییەكان


— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٦) ی ٢٥/شوبات/١٩٢٦
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٣٢) ی ٩/ئەیلول/١٩٢٦
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٣٦) ی ١٩٢٦/١٠/٧
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٤٤) ی ٢/كانوونی یەكەم/١٩٢٦
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٤٥) ی ١٩٢٦/١٢/٩
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٦٩) ی ٧/حوزەیرانی/١٩٢٧
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٢٥٧) ی ١٤/ئاب/١٩٣٠
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٢٩٣) ی ١٤/ئەیلولی/١٩٣١
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٣١٢) ی ١٩٣٢/٢/٢٥
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٣٢٦) ی ١٩٣٢/٦/١٦
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٣٣٦) ی ٢٥/ئاغستوس/١٩٣٢
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٣٦١) ی ٢٠/نیسان/١٩٣٣
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٣٧٦) ی ٧/ئەیلول/١٩٣٣
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٤٢٣) ی ٢٢/كانوون دووەمی/١٩٣٤
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٤٢٧) ی ١٩/كانوونی دووەمی/١٩٣٥
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٤٣٠) ی ٩/شوبات/١٩٣٥
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٤٣١) ی ١٦/شوباتی/١٩٣٥





— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٥٣٥) ی ١٩/تەمووز/١٩٣٧
— ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٥٣٨) ی ١٩/ئاب/١٩٣٧
— ڕۆژنامەی ژیانەوە، ژ (٣٤) ی ٦/ئاب/١٩٢٥
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٥٦٠) ی ١٩٣٩/٣/١٦
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٥٨٠) ی ١٩٣٩/٩/١٤
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٥٩٧) ی ١٦/مایسی/١٩٤٠
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٦٠٥) ی ١/ئاب/١٩٤٠
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٦٢٠) ی ٦/مارت/١٩٤١
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٦٧٩) ی ١٣/ئابی/١٩٤٢
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٦٨٤) ی ١/تشرینی یەكەمی/١٩٤٢
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٦٨٦) ی ٢٢/تشرینی یەكەمی/١٩٤٢
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٧٠٦) ی ١٩٤٣/٥/٧
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٧٩٢) ی ١٩٤٥/٦/٢٨
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٨١٢) ی ٦/كانوونی یەكەمی/١٩٤٥
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٨١٨) ی ٢٤/كانوونی دووەمی/١٩٤٦
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٨٢٠) ی ٢١/شوبات/١٩٤٦
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٨٥٥) ی ١١/كانوونی دووەمی/١٩٤٧
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٨٦٨) ی ٢٤/نیسان/١٩٤٧
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٩٠٧) ی ٢٦/شوبات/١٩٤٨
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٩٣٤) ی ٩/ئەیلول/١٩٤٨
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٨٤٨) ی ٢٠/كانوونی دووەمی/١٩٤٨
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٩٥٣) ی ٣/شوبات/١٨٤٩
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٩٥٨) ی ١٧/مارت/١٩٤٩
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (٩٦٧) ی ١٩٤٩/٦/٢
— ڕۆژنامەی ژین، ژ (١٠٠١) ی ٩/ئازار/١٩٥٠

**گۆڤاره كوردییه‌كان**

ــ گۆڤاری ئاینده، ژ(٦) ی ساڵی ٢٠٠٦

ــ گۆڤاری ئه‌كادیمی ( كۆڕی زانیاری كوردستان )، ژ(١) ساڵی ٢٠٠٢

ــ گۆڤاری باسكار، ژ(٦) ی ساڵی ٢٠٠١

ــ گۆڤاری به‌یان، ژ(٢) ی شوباتی ١٩٧٠

ــ گۆڤاری به‌یان، ژ(٧٩) ی مایسی ١٩٨٢

ــ گۆڤاری دیاری كوردستان، ژ(١٣ــ١٤) ی سالی ١٩٢٦

ــ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ(١٠٥) ی ئازاری ساڵی ١٩٨٥

ــ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ(١١٢) ی كانوونی دووه‌می ١٩٨٦

ــ گۆڤاری زانكۆ بۆ زانسته مرۆڤایه‌تییه‌كان، ژ(١٠) ی ساڵی (٤) ی ٢٠٠٠

ــ گۆڤاری زانكۆی سلێمانی، ژ(٥) ی سالی ٢٠٠١

ــ گۆڤاری زانكۆی سلێمانی، ژ(٢٠) ی حوزه‌یرانی ٢٠٠٧

ــ گۆڤارا زانكۆیا دهوك، هژمارا (١) ته‌باخ ١٩٩٨

ــ گۆڤاری ژین (ئه‌سته‌مول) ژ(٥) ی كانوونی دووه‌می ١٣٣٤

ــ گۆڤاری ژین (ئه‌سته‌مول )، ژ(٩) ی ١٦/كانوونی دووه‌می/١٣٣٥رۆمی

ــ گۆڤاریشه‌فه‌ق، ژ(١) ی (١٥) كانوونی دووه‌می ١٩٨٥

ــ گۆڤاری گه‌لاوێژ، ژ(٤) ی نیسانی ١٩٤٣

**سه‌رچاوه فارسییه‌كان**

ــ محمد رضا شفیع كدكنی، ادوار شعر فارسی، انتشارات توس، ١٣٥٩

ــ یحی ارین پور، از صبا تا نیما، تاریخ (١٠٥) ساله ادب فارسی، جلد اول، انتشارات زوار چاپ گلشن، چاپ هفتم، ١٣٧٩

ــ یحی ارین پور، از نیما تا روزگار ما، چاپ سوم، تهران، انتشارات زوار چاپ گلشن، ١٣٧٩

**سه‌رچاوه عه‌ره‌بییه‌كان**

**كتێبه عه‌ره‌بییه‌كان**

ــ د. ابراهیم السامرائی، لغة الشعر بین جیلین، بیروت، الؤسسة العربیة للدراسات والنشر، ١٩٨٠.

ــ د. احسان عباس، فن الشعر، بیروت، دار بیروت للطباعة والنشر، ١٩٥٩.

ــ احمد الشایب، تأریخ الشعر السیاسی الی منتصف القرن الثانی القاهرة، مكتبة النهضة المصریة، ١٩٧٦.

ــ د. احمد محمد المعتوق، اللغة العلیا ــ دراسات نقدیة فی لغة الشعر، بیروت، المركز الثقافی العربی، ٢٠٠٦.

ــ امال الدین احسان، من الادب التركی الحدیث، الهیئة العامة للتألیف والنشر، ١٩٧٠

ــ د. جابر احمد عصفور، الصورة الفنیة في التراث النقدی البلاغی، القاهرة، دار الثقافة للطباعة والنشر، ١٩٧٤.

ــ د. جوزیف میشال شریم، دلیل الدراسات الاسلوبیة، المؤسسة الجامعیة للدراسات و النشر والتوزیع، ١٩٨٤.

ــ دیڤید دیتش، مناهیج النقد الادبی، ترجمة محمد یوسف نجم، بیروت، دار صادر، ١٩٦٧ .

ــ سی. دی. لویس، الصورة الشعریة، ترجمة د. احمد نصیف الجنابی و مالك میری و سلمان حسن ابراهیم، دار الرشید للنشر، بغداد، ١٩٨٢ .

ــ د. صلاح فضل، منهج الواقعیة فی الابداع الادبی، القاهرة، الهیئة المصریة العامة، ١٩٧٨

ــ عباس توفیق، نقد الشعر العربی الحدیث فی العراق من ١٩٢٠ــ١٩٥٨، بغداد، دار الرسالة للطباعة، ١٩٧٨

ــ عبدالعزیز الدسوقی، جماعة ابولو و اثرها فی الشعر الحدیث، ج١، القاهرة، شركة الامل للطباعة والنشر، ٢٠٠٠.

ــ د. عبدالعزیز الكفراوی، تأریخ الشعر العربی، القاهرة، دار النهضة للطباعة والنشر، ١٩٧١.

ــ عبدالقادر القط، حركة الدیوان و اثرها فی النقد الادبی والشعر، بغداد، دار الحریة للطباعة، ١٩٨٩ .

ــ عبد اللطیف بندر اوغلو، اشارات اولیة فی الشعر التركی، الموسوعة الصغیرة (١٢٧)، بغداد، منشورات دار الجاحظ، ١٩٨٣.

ــ عبداللطیف بندر اوغلو، قصائد مختارة من الشعر التركی المعاصر، بغداد، دار الشؤون الثقافیة، ١٩٨٦.

ــ عربیة توفیق لازم، حركة التطور و التجدید فی الشعر العراقی الحدیث، بغداد، مطبعة الزمان، ١٩٨٦.

ــ د. عزالدین مصطفی رسول، الواقعیة فی الادب الكردی، صیدا ــ بیروت، منشورات دار المكتبة المصریة، ١٩٦٦.

ــ د. علی البطل، الصورة فی الشعر العربیــ دراسة فی اصولها و تطورها، بیروت، دار الاندلس، ١٩٨٠.

ــ علی عباس علوان، تطور الشعر العربی الحدیث فی العراق، وزارة الثقافة والاعلام، ١٩٧٥ .

ــ عمران خضیر حمید الكبیسی، لغة الشعر العراقی المعاصر، كویت، وكالة المطبوعات.

ــ د. كمال ابو دیب، جدلیة الخفاء و التجلی، ط١، بیروت، دار العلم للملایین، ١٩٧٩.

ــ مجدی وهبة، معجم مصطلحات الأدب، بیروت، مكتبة لبنان، ١٩٧٤.

ــ محمد الصادق عفیفی، النقد التطبیقی و الموازنات، القاهرة، مكتبة الخانجی، ١٩٧٨.

ــ موسوعة الهلال الاشتراكیة، اشترك فی تحریرها ــ ابراهیم عامر ــ د. احمد عبدالرحیم مصطفی، احمد محمد غنیم، مطبعة اهلال، ١٩٧٠ .

## گۆڤاره عەرەبییەکان

ــ گۆڤاری گەلاوێژی نوێ (الملحق العربی )، العدد (٧) کانون الثانی، ٢٠٠٤ .

ــ مجلة الاداب الاجنبية، العدد (١١٨)، ٢٠٠٤.

## نامە زانكۆيیەکان ( کوردییەکان )

ــ حوسێن غازی ئەمین، نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە ساڵی ١٩٣٢ــ١٩٤٩ لە کوردستانی عیراقدا (نامەی ماستەر)، زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٥.

ــ حەسەن علی عومەر، ڕۆمانسیەت لە هۆنراوەکانی پیرەمێرد دا ( نامەی ماستەر ). زانکۆی بەغدا، کولێجی پەروەردە، ٢٠٠٤.

ــ فؤاد حسین، هۆنراوەی نیشتمانی لە ئەدەبی کوردیدا لە کۆتایی سەدەی نۆزدە تا ساڵی ١٩٤٥ (نامەی دکتورا)، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٦.

ــ محمد فاضل مصطفی، زێوەر ژیان و بەرهەمی (نامەی ماستەر)، هەولێر، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٩.

ــ محەمەد ئەمین محەمەد نوری ئەمین، شەقڵی نوێخوازی لە شیعری کوردی و فارسی سەدەی بیستەمدا (نامەی ماجستێر )، زانکۆی سلێمانی، کۆلێجی زمان، ٢٠٠٤.

## نامە زانكۆيیەکان ( عەرەبییەکان)

ــ صالح حسین الجمیلی، شعر حافظ جمیل، دراسة نقدیة ( اطروحة ماجستیر )، جامعة الموصل، کلیة الاداب، ١٩٨٧.

## دەستنووسەکان

ــ عەزیز گەردی، رابەری کێشی کلاسیکی کوردی، بەرگی دووەم (دەستنووس) .

ــ عەزیز گەردی، رابەری کێشی کلاسیکی کوردی، بەرگی سێیەم (دەستنووس).

## بیبلوگرافیا ــ کوردییەکان

ــ ڕۆژنامەی ژین، ژ ١ــ٨١، ئامادەکردنی رەفیق ساڵح و لێکۆڵینەوەی صدیق ساڵح، بەرگی یەکەم، سلێمانی، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٢.

## سایتی ئەنتەرنێت

ــ د. کریم الوائیلی، تدفق الینبوع قراءة نقدیة فی مدرسة الدیوان، سایت (مینشاوی).

## ملخص البحث

من المعلوم جدا، ان الشاعر ثيرةميرد يعد من الاصوات الادبية والثقافية البارزة فى الادب الكردى. على الرغم من قلة الدراسات عنة لاسباب، ربما تعود الى ضبابية الحالة السياسية فى زمن الشاعر وبعدة، فان عالمة الادبى وبخاصة الشعرى منه ان لم يدرس بصورة واعية وعميقة فان الباحث لا يصل الى الحقيقة العلمية.

من هنا فان دراستنا لنتاجات الشاعر هى بحد ذاتها محاولة لانجاز ابداعية الشاعر داخل اطر الدراسات الادبية و النقدية الكردية و ذلك للسيطرة على أمر النسيان من جهة و اللجؤ الى دراسة علمية لعالم الشاعر الشعريى من جهة اخرى. فمن اجل تحقيق هذة الغاية و اظهار حقيقة صوت الشاعر حددنا هذا الموضوع (( صوت ثيرةميرد فى حركة الشعر الكردى الحديث )) كعنوان لأطروحتنا.

تتكون هذة الدراسة من ثلاثة فصول و مباحث وصولا الى مجموعة من الاستنتاجات.

الفصل الاول بعنوان ( ثيرةميرد و حركة التجديد الشعر الكردى ) يعالج ثلاثة محاور رئيسية: الاول بعنوان ( الشعر الكردى الحديث ـ مفهوم و رؤية ) ففى هذا المحور تطرقنا الى الحركة الادبية التركية و العربية والفارسية واخيرا الكردية باعتبار ان هناك حالة من التواصل بين هذة الاداب و بخاصة تأثر الادب الكردى عموما و الشعر خصوصا بهذة الاداب الثلاثة المجاورة.

وفى المحور الثانى الذى هو بعنوان ( رؤية ثيرةميرد التجديدية ) عالجنا ثلاثة حقول معرفية لـ (ثيرةميرد) وهى السياسة و الاجتماع و الثقافة باعتبار ان هذة الوحدات لها صلة قوية بتجربة الشاعر الادبية و الشعرية. والمحور الثالث تناول هذا العنوان ( الصوت التجديدى لـ ثيرةميرد فى المجال الادبى ).

يتناول الفصل الثانى الذى هو بعنوان ( النصوص الشعرية لـ ثيرةميرد دراسة فنية ) ثلاثة محاور رئيسة وهى: اللغة و الصورة الشعرية و الموسيقى الشعرية. وقد حاولنا تسليط الضوء على ابداعية الشاعر التجديدية وبيان الجوانب الفنية منها.

الفصل الثالث والذى هو بعنوان ( النصوص الشعرية لـ ثيرةميرد ـــ دراسة فى المضمون) ان الشاعر هنا بوعى فكرى و ثقافى استخدم موضوعات سياسية و وطنية و قومية و اجتماعية و جمالية



و احتفالية والتى جميعها تجسد صوت ثيرةميرد التجديدى فى ادبيات الكرمانجية الجنوبية فى النصف الاول من القرن العشرين.

اخيرا، توصلنا فى هذة الدراسة الى مجموعة من الاستنتاجات والتى نطمح ان تكون جديدة و علمية فى أن واحد.

